# حزبی سیاسی

# و

# تیۆری ڕێکخستن

نووسینی

محمد فاتح

٢٠١٠

## نـــــــــــــــــاوەرۆك

لا پـــەڕە

# پێشەکی

لێکۆڵینەوەکان دەربارەی کۆمەڵەو گروپ و ڕێکخراوە سیاسیەکان لەو بابەتە نوێیانەن کە لەلایەن کۆمەڵناس و دەروونناسانەوە جێگای بایەخ پێدانیان بووە.

چەمکی حزبی سیاسی بەو بۆچوونە نوێیە سەردەمیەی کە ئێستا زانراوە لەناوەراستی سەدەی نۆزدەدا سەری هەڵداوەو بەدرێژایی ڕۆژگاری پڕ لەبەسەرهات و ڕووداو، گۆڕان بەسەر ئەو چەمکەدا هاتووە، ئەگەرچی تا ئێستاشی لەگەڵدابێت شارەزایان لەسەریەك پێناسەی دیاریکراو پێکنەهاتوون و جیاوازی هەیە لەبیروراو بۆ چوونەکانیان، کە دەکرێ بەشێکی زۆری هۆیەکانی ئەو جیاوازییانە پەیوەندی بەتوخم و پێکهاتە و ئایدیۆلۆژیای ئەو حزبانە هەبێت سەرەڕای ئاراستەی هزری خودی نووسەران.

ئەوی هەموو لایەك لەسەر ڕێککەوتوون، ئەوەیەکە هەر حزبێکی سیاسی چی بێت قەبارەو پێکهاتەو ئایدیۆلۆژیای، یەك لەتوخمە سەرەکی و بنچینەییەکانی ڕێکخستنە.

ڕێکخستن چیە؟ یاساو پرنسیپەکانی چیە؟ کەی ئەم ڕێکخستنە هاوسەنگ و کارا دەبێت؟ کەی سنووردار یان توانای گەشەپێدان و گۆڕانی دەبێت.

زانینی ڕەفتاری ئەندام، گروپەکانی ناو هەر ئۆرگانێك، ئامانجێکە ئەو تۆژینەوە مرۆڤایەتیانە هەوڵی بۆ دەدەن، جۆری ڕێکخراوەکان، ڕەفتاری ئەندامانیان، بنەمای چالاکیەکانیان، پەیوەندییە ناو خۆییەکانیان، ململانێ و کارتێکردنی نێوانیان، لەم بارەوە چەندین بیروڕاو تیۆری جۆراو جۆر دارێژراوە.

زانستی ڕێکخستن بەپێی توێژینەوە زۆرو جۆراو جۆرەکان، ئەمڕۆ بۆتە زانستێك کەلێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر ئەنجام دراوە.

دیارە چەمکی ڕێکخستن هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، دەگرێتەوە، کارگێڕی، دارایی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری..لەبەر ئەوەی سیستمی ژیان بەردەوام پێویستی بەپەرەپێدان و چاو دێری هەیە، پێویستی بەبەراورد کردنی نێوان ئامانج و ئەنجامەکان هەیە.

ئەوی مەبەست لەچوار چێوەی ئەم نووسینە ڕێکخستنی سیاسیە، ئەو ڕێکخستنەی بڕبڕەی پشتی هەموو حزب و ڕێکخراوێکی سیاسیە.

لەپێناو تێگەیشتنێکی تەواو پڕمەبەست بۆ ئەم ئامانجە، لەماوەی ئەم نووسینەدا بایەخ دراوە بەڕێکخستن وەك تیۆرێك.

لەم بوارەدا ئاماژە بۆ بیروڕای چەندین شارەزاو سەرچاوەی ناوخۆیی و بیانی کراوە، هەروەها پشت بەبەرنامە و پێڕەوی ناو خۆی چەندین حزبی گەورەو سەرکەوتوو بەستراو کە لەوڵاتە جیاوازەکانی جیهانی ڕۆڵیان هەیە.

دیارە هیچ کارێك بێ کەم و کورتی نابێت، هیوادارم بەم کارە کە لێنێکم پڕ کردبێتەوە لەپێویستیەکانی کتێبخانەی کوردی..

**هەولێر**

٢٠٠٩/٩/١٥

# بەشی یەکەم

## دەربارەی حزب

- یەکەم / بیرۆکەی حزب و ڕێکخراو
- دووەم / سەرهەڵدانی حزبی سیاسی
- سێیەم/ چەمك و پێناسەی حزبی سیاسی
- چوارەم/ پۆلین کردنی حزبی سیاسی
- پێنجەم/ ئەرك و فەرمانی حزبی سیاسی
- شەشەم/ توخمە سەرەکییەکانی حزبی سیاسی

# باسی یەکەم

## بیرۆکەی حزب و ڕێکخراو لەمێژوودا

لەسەردەمی دەسەلاتداری کۆنی یۆنانی و ڕۆمانی، گردبوونەوەی پیشەیی بەدیکراوەو چەند تائفەیەکی پیشەدار، شێوەیەکی فەرمیان هەبووە، هەندێ لەو کۆبوونەوەو گردبوونەوانە وەك نیمچە بازنەیەکی پیشەیی لەجێگای تایبەت کۆ دەبوونەوە.

بەپێی یاساکانی (تیودوسیوس) لەو سەردەمە سێ یەکێتی پیشەیی هەبووە، هەموویان لەژێر چاودێری حکومەتدا بوون، ئەو سێ یەکێتیەش بریتی بوون لە (یەکێتی کرێکارانی کانەکان، کارکردن لەبواری هاتووچۆی دەریایی، یەکێتی پیشەخۆراکیەکان) هەروەها یەکێتی پیشە جۆراو جۆرەکان هەریەکە لەو یەکێتیانە بەرپرس و ئەمینداری تایبەتی خۆی هەبووە. (١)

ئەوروپا لەچاخەکانی ناوەڕاست، بارێکی ئابووری سەرەتایی ساکاری هەبووە، بۆیە دەبوایە چاوەڕێی ئەوە بکرێت تاپەرەپێدان و پێشکەوتنی شارستانیەت بەدی دێت لەسەدەی (١٧) دا کە بووە هۆی دابەشبوونی کارو پاشان پەیدابوونی چینە پیشەییەکان، لەدووایدا ئەو چینانە گردبوونەو لەسەر شێوەی (هاورێکانی پیشە) هەر وەك لەفەرەنسا، بەلام لەوڵاتی ئینگلتەرا بەوکارە دەوترا (جیلد، هانزا) لەکاتێکدا لەناوچەکانی وڵاتی ئەلمانیا ئەو یەکێتیانە لەژێر ناوی (زونفتن) بانگ دەکرا.

# باسی یەکەم

## بیرۆکەی حزب و رێکخراو لەمێژوودا

لەســەردەمی دەســەڵاتداری کــۆنی یۆنــانی و رۆمــانی، گردبوونــەوەی پیــشەیی بەدیکراوەو چەند تائفەیەکی پیشەدار، شێویەکی فەرمیان هەبووە، هەنــدێ لـەو کۆبوونەوەو گردبوونەوانە وەك نیمچە بازنەیەکی پیشەیی لەجێگای تایبـەت کـۆ دەبوونەوە.

بـەپێی یاساکانی (تیودوسیوس) لـەو سـەردەمە سێ یـەکێتی پیـشەیی هـەبووە، هەموویان لەژێر چاودێری حکومەتدا بوون، ئەو سێ یەکێتیەش بریتی بوون لە (یـەکێتی کرێکـارانی کانـەکان، کـارکردن لـەبواری هاتووچـۆی دەریـایی، یـەکێتی پیـشەخۆراکیەکان) هـەروەها یـەکێتی پیـشە جـۆراو جۆرەکـان هەریەکـە لـەو یەکێتیانە بەرپرس و ئەمینداری تایبەتی خۆی هەبووە. (١)

ئـەوروپا لەچاخەکانی ناوەڕاست، بـارێکی ئـابووری سـەرەتایی سـاکاری هـەبووە، بۆیـە دەبوایـە چاوەڕێی ئـەوە بکرێـت تاپەرەپێـدان و پێـشکەوتنی شارسـتانیەت بەدی دێت لەسەدەی (١٧) دا کە بووە هۆی دابەشبوونی کارو پاشان پەیـدابوونی چینە پیشەییەکان، لەدووایدا ئەو چینانە گردبوونەو لەسەر شێوەی (هاورێکـانی پیشە) هـەر وەك لەفەرەنـسا، بـەڵام لـەوڵاتی ئینگلتـەرا بـەوکارە دەوتـرا (جیلـد، هـانزا) لەکاتێکـدا لەناوچـەکانی وڵاتــی ئــەڵمانیا ئــەو یەکێتیانــە لــەژێر نــاوی (زونفتن) بانگ دەکرا.

لەکتێبی (پیشەکان) ساڵی (١٢٦٨ز) نووسەرەکەی (ئیتین برالو) نزیکەی سەد پیشەی جۆراو جۆری باس کردووەو بەسەر شەش گروپی دابەشکردووە، کەملکەچی دەسەڵاتەکانی (لویسی نۆیەم) بوونەو فەرمانبەری دادەنا بۆ چاودێری کردنیان.

ڕێکخستنی ناو خۆی ئەو یەکێتیانە ئەگەر بەسیستمی (سوێندخۆران) یاخود ئازاد بوو بێت، هەمان پرەنسیپیان پێرەو کردووە.

ئەو یەکێتیانە پێکهاتبوون لە (وەستاکان، هاورێکان، کرێکاران) بەلام ئەنجومەنێکی بالایان هەبووە، کەتەنها وەستاکان تیادا بەشداریان دەکردو بەرنامەی یەکێتیەکەیان دادەنا، ئەو بەرنامەیە وەك پلانی کارکردن بووە.

ئەو پێکهاتە پیشەییانە، کۆمەڵەپرەنسیپ و ڕێنماییەکی توندی لەخۆ گرتووە دەربارەی مندالان، کرێکاران، هەروەها پاش ماوەیەك گروپ و دەستەی تایبەتیان بۆ خۆیان دروست کردووە، ئەو گروپانە بوونەتە بنەمایەك بۆ دروست بوونی سەندیکاکانی ئێستا.

بەولاتی ئیتالیا کار بەپسپۆری کراوەو بووە بەهۆی پۆلین کردنی پیشەکان، وەك پزیشکان، تۆمارکەرانی گرێبەستەکان، گەورە بازرگان، سەرمایەداران، هەریەکە جۆرە یەکێتیەکی جیاوازیان هەبووە، بەیەکێتی هونەرە گەورەکان ناسرابوون.

بەلام یەکێتی هونەرە بچووکەکان (یەکێتی ئاسنگەران، دارتاشان) ئەوانە بەرنامە کاری پیشەییان هەبووە، بوونە بەهۆی دروست بوونی ناوکەی چینی کرێکارە پیشەسازییەکان و پاشان پرۆلیتاریای پیشەسازی.

بەهۆی بارودۆخی ناوخۆیی لەولاتانی ئەوروپا ئەو یەکێتیانە لەناو چوون و هەڵوەشاونەتەوە، ئەمەش هۆکارێك بووە بۆ دروست بوونی چین لەبواری کارکردندا.

بەرژەوەندییەکانی کرێکاران هیچ پشتگیرییەکی نەبووە تەنها لەڕێگای دەس پێشکەرییە خودی و ناوچەییەکان نەبێت پاشان لەڕێگای دروست بوونی سەندیکاکان، ئەو سەندیکایانە لەسەرەتای دروست بوونیانەوە تا ماوەیەکی زۆر شەرعیەتی کارکردنی ڕەسمیان نەبووە، لەفەرەنسا تاساڵی ١٨٧٢ ، لەئیتالیا تاساڵی ١٨٧١ز.

لەسەردەمی ئێستادا ئاسەواری ئەو یەکێتیانە لەهەندێ یاساکاندا هەر ماوەتەوە.
دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە ئەو گروپە کۆمەڵایەتیانە لەڕووی دروست بوونیان و پێکهاتنیان دوو شێوەی سەرەکیان هەبووە: (٢)

**یەکەمیان** // کۆمەڵی لەدایك بووی سروشتین و دەستی کەس لە هاتنیاندا نیە، چونکە بەهۆی پەیوەندی کەسایەتی و نزیکی و خزمایەتیەوە دێنەدی بەبێ ئەوەی پێویستی بەکار یان بەبەرنامەی ئەندامەکانیانەوە هەبێ، وەك خێڵ و گروپە سەرەتاییەکان کە هەیە، دەبینرێت سەرۆك خێڵ زاڵە بەسەر تاکەکان و لەناو خێزانیشدا باوك لەڕووی فیکرییەوە کاریگەری بەسەر ڕۆڵەکانی هەیە.

**دووەمیان** // گروپ دروستکراون لەسەر بنەمای هاریکاری و باوەڕ بوونی هزری و ڕێککەوتن لەسەر چەند بنەماو ئامانجی دیاریکراو بۆ بەدیهێنانی ئامانجە هاوبەشەکانیان، ئەم دیاردەیەش لەناو حزبە سیاسی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان بەدەر دەکەوێت.

# باسی دووەم

## سەرهەڵدانی حزبی سیاسی

١- بێ گومان حزبی سیاسی وەك قەوارەیەکی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە ژێر کاریگەری ژینگەو ئەو ناوەندە کۆمەڵایەتیەی کە تیادا سەری هەڵداوەو لەبواری ئاراستەی جیاوازدا حزب بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەتەمەنیدا دیلی ئەو کارتێکردنانە دەمینێتەوە، بەڵام ئەو راستیە رۆڵی گۆڕانکاری حزب دوورناخاتەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و سیاسی.

دیاردەی حزبە سیاسەکان بەچەمکە هاوچەرخیەکەی ڕەگ و ڕیشەکەی پڕە لەو رووداو بەسەرهاتانەی دەر ئەنجامی ئەو پەرەپێدان و گۆڕانانەن کە گوزارشت لەبزووتنەوەو شۆڕشە میللیەکان دەکەن و بەرەنگارییە کۆمەڵایەتیەکان و پەرەپێدانە هزرییەکان دەنوێنن کە بەگشتی بنەما مێژووییەکانی پێکدێنێ و زەمینەی کۆمەڵایەتی و کەش و هەوای سیاسی لەبار ئامادە دەکەن بۆ سەرهەڵدانی ئەو دیاردەیە، لەوانە : (٣)

- چاکسازی ئایینی، بەتایبەتی ئەوی لەسەر دەستی (مارتن لوثر) لەئەلمانیا سەری هەڵدا ساڵی (١٥١٧) و هەروەها جۆن کالفن لە فەرەنسا ساڵی (١٥٣٤).
- دامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی.
- شۆڕشی گەورەی پیشەسازی.
- پەیدابوونی ئایدیۆلۆژیا گەورەکان (لیبرالی — سوسیالستی).

- بەرپابوونی شۆڕشە گەورەکان، شۆڕشی فەرەنسی، شۆڕشی ئەمەریکی، شۆڕشی کۆمونیستی.

٢- لەنێوان توێژەران ڕێککەوتنێك هەیە لەسەر ئەوەی کە حزبە سیاسیەکان بە چەمکە نوێیەکەی دیاردەیەکی تازەیە لەسەدەی نۆزدەدا دەستی پێکرد، سەر هەڵدان و دروست بوونیان دوو شێوازی وەرگرتووە.

## یەکەم //

## حزبەکانی پێکهاتەی ناو پەرلەمان.

مێژوو باس لەسەر هەڵدانی حزبە سیاسیەکان دەکات هەلگری خسلەتە نوێیەکان کەبەهۆی بەش بەش بوونی پەرلەمان بووە بەچەند گروپ و بەشێکی سیاسی، بەکاریگەری فاکتەری ئایدیۆلۆژی یان ویستی بەرگریکردن لەبەرژەوەندییە پیشەیی یاخود هەرێمایەتیەکان.

ڕەنگە ویستی بەرگریکردن لەبەرژەوەندییە هەرێمایەتیەکان، هۆکاری بنچینەیی بێت لەدروست بوونی گروپەکانی ناوپەرلەمانی فەرەنساوی، بەلاّم هەر زوو بۆ ئەو گروپە پەرلەمانیانە دەرکەوت کەیەك دەنگی و گربوونەوەیان تەنها بریتی نیە لەباس کردنی بابەتە هەرێمایەتیەکان، بەڵکو لەوە تێپەڕ دەبێت بۆ ئەوەی بابەتە سیاسیەگشتیەکان و کێشە نیشتمانیەکان بگرێتە خۆی بۆیە لەهەوڵی ئەوەدا بوون کە نوێنەرانی ناوچەکانی تریش بۆ لای خۆیان ڕاکێش بکەن و لەگەڵ ئەوانی تر یەك ڕابن.

سەرەڕای فاکتەرە هەرێمایەتی و ئایدیۆلۆژیاییەکان، فاکتەری بەرژەوەندی ڕۆڵی خۆی بینی لەپێکهێنانی گروپەکانی ناو پەرلەمان، وەك دروست بوونی چەند دەستەیەك لەسەر بنچینەی سەندیکایی کە ئامانجەکەی پارێزگاریکردنە

لەبەرژەوەندی ئەنـدامانی و کارکردن بـۆ دووبـارە هەڵبژاردنـەوەیان، بەتایبـەتی لەو جۆرە سیستمانەی هەلبژاردن پێویستی بەهەوڵێکی بەکۆمەڵدایە.

دروست بوونی حزبە سیاسیەکان پشت بەستونەبووە تەنها لەسەر دابەش بـوونی پەرلەمان بـۆ چـەند کۆمـەڵ و بەشێك بـەڵکو پشت بەسـتوو بـووە بـەپێکهێنانی ئەنجومەن و لیژنەکانی هەلبژاردن، ئەو ئەنجوومەن و لیژنانەی کە پێکهاتوون بۆ ناساندنی پاڵێوراوان بەدەنگدەران و هەوڵدان بۆ کارتێکردنیان.

بـەم شـێوازە حزبـە سیاسـیەکان لـەئینگلترا پێکهـاتوون، لەسـاڵی (١٦٨٠ز) لـەناو پەرلـەمانی بـەریتانیا بەشـێك پێکهـات لـەبازرگان و پیـشە سـازو تـەکنوقرات و بورژوازییەکان بەگشتی کە چینێکی کراوەو پێشکەوتوو بوون و کەوتنە لایـەك و پێیان دەوترا (ویگ) لەبەرامبەردا چینێکی تر پێکهات لـە دەرەبـەگ و مولکـدارو پیـاوانی ئـایینی کـە بـەرگری و پارێزگاریـان لـەداب و نـەریتی رەسـەنی وڵات دەکردن و پێیان دەوتـرا (تۆری) کـە لـەدوای چاکسازییەکانی (١٨٣٠ – ١٨٨٤) هـەر دوو حزبی لیبرال (ئازادیخوازان) و پارێزگارانی لێ پێکهات. (٤)

لەکتێبی – موسوعە علم الاجتماع – داهاتووە: (٥)

تاسـاڵی (١٨٥٠)ز لـەهیچ وڵاتێـك بـەو مانـاو پێناسـەی ئێـستا حزبایـەتی نـەبووە، بەڵام دەستەو یانەو کۆبوونەوە هەبووە.

## دووەم //

## حزبە سیاسیەکانی پێکهاتەی دەرەوەی پەرلەمان .

لێرەدا مەبەست لەو حزبانەیە کەبـە هـەوڵ و تێکۆشـانی کۆمەڵـە فیکرییـەکان و یانـە میللـی و سـەندیکا کرێکاریـەکان و جـۆری تـر پێکهـاتوون لـەدەرەوەی پەرلەمان، بەڵام پێویست دەکات کە سەرنجی ئـەوە بـدەین جیاوازییـەکانی نێوان ئـەو حزبانـەی لـەناو پەرلـەمان دروسـت بوونـەو ئـەوانی لـەدەرەوە بـوون

یەکلاکەرەوە نیە، بەڵکو ئەوە هەوڵدانێکە بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنی زاڵ بوو لەپێکهاتنی ئەو حزبە، چونکە تێکەڵاو بوونی هەردوو شێوازەکە زاڵە، هەروەها دەبێ لەوە ئاگاداربین کە ناکرێت بووترێت ئەم حزبانە تەنها پێکهاتەی ناو پەرلەمانن یاخود ئەوانی تر پێکهاتەی دەرەوەی پەرلەمانن بەپێی ئەم بنچینەیە چەندین حزبی سیاسی پێکهات کە سەندیکای کرێکاران ڕۆڵیان هەبووە لەدروست بوونیان بۆ ئەوەی هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان لەپەرلەمان مسۆگەر بێت.

هەروەها بە هەوڵ و تێکۆشانی کۆمەڵەی هەرەوەزی و کشتوکالیەکان چەندین حزبی جوتیاری دامەزرا، شایانی باسە کۆمەڵە هزرییەکان و یەکێتیە کرێکاریەکان کاریگەری گەورەیان هەبووە لەدەرکەوتنی حزبە چەپ ڕەوەکان لەماوەی سەدەی نۆزدەدا لەئەوروپا.

کۆمەڵەنهێنیەکان یەك لەگەورەترین فاکتەرە دەرەکیەکانە لەپێکهاتنی حزبە سیاسیەکان، زۆر جار هەندێ کۆمەڵە بەنهێنی کاردەکەن و لەهەوڵی ئەوەدان کەمۆڵەتی فەرمیان پێ بدرێت و پاشان بوونەتە حزبی سیاسی.

نموونەی ئەو کۆمەڵانە گروپەکانی بەرهەڵستکاری لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم لەئەوروپا، وەك بزووتنەوەی کۆماری میللی لەفەرەنسا، حزبی دیموکراسی مەسیحی لەئیتالیا.

لێرەدا دەبێ ڕۆڵی کۆمەڵەو ڕێکخراوە ئابوورییە گەورەکان پشت گوێ نەخەین لەدامەزراندنی چەند حزبێکی راستڕەو وەك (بانکەکان، پرۆژە ئابوریەکان، سەندیکاکان).

(موریس دفریجیە) لەکتێبەکەی (حزبە سیاسەکان) ئاماژە بۆ ڕۆڵی ئەنجومەن و کۆمەڵەکان دەکات لەدامەزراندنی حزبەکانی دەرەوەی پەرلەمان، ئەو کۆمەڵەو

ئەنجومەنانە بنکەی بنچینەیی پێك دەهێنن بۆ دروستبوونی حزبە سیاسیەکان لەئەوروپا، لەو ڕێکخراوانە: (٦)

١- سەندیکای کرێکاران و کۆمەڵەی جوتیاران.

٢- کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و هزری.

٣- ڕێکخراوی خوێندکاران.

٤- کلێسەو تیپەئاینیەکان.

٥- کۆمەڵەی جەنگاوەرە دیرینەکان.

٦- کۆمەڵە نهێنیەکان.

## ئاکارە جیاوازەکانی نێوان حزبەکانی پێکهاتەی ناو پەرلەمان و حزبەکانی پێکهاتەی دەرەوەی پەرلەمان: (٧)

١- **ئامانج**: حزبە پەرلەمانیەکان بەهەموو شێوەیەك لەهەوڵی گەیشتن یان مانەوەن لەپەرلەماندا، بەڵام حزبەکانی تر ئامانجەکانیان دوورترە.

٢- **ناوەندێتی**: ئەو حزبانەی لەدەرەوەی پەرلەمان پێکهاتوون ڕێبازی ناوەندێتی زیاتر پیادە دەکەن لەوانی تر.

٣- **ڕێکخستن**: ئەو حزبانەی لەدەرەوەی پەرلەمان پێکهاتوون لەرووی ڕێکخستن و دیسپلینەوە زیاتر توندترن تا ئەوانی تر .

٤- **ڕۆڵی نوێنەرایەتی لە پەرلەمان**: نوێنەرانی حزبە پەرلەمانیەکان پێگەی سەرکردایەتیان هەیە لە ناو حزب، بەڵام ئەوانی تر ڕۆڵیان مام ناوەندییە.

## حزبەکرێکارییەکان : (٨)

ئـــەم حزبانـــە ســـەرەتای دامەزرانـــدنیان لـــەولاتانی ئـــەوروپای ڕۆژ ئـــاواو ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەگەڕێتەوە بۆ سالانی بیست و سییەکانی سەدەی نۆزدەدا.

بـەلام حزبـی تونـدو تـۆلْ نەبوونـە، ژمـارەی ئەنـدامانیان کـەم بوونـەو زۆری نەدەخایاند هەلدەوەشانەوە.

حزبـی (تـشارت)ییـەکان کـە لـەئینگلترا دامـەزرا لەسـەرەتای چـلەکانی سـەدەی نۆزدەدا کاریگەری قولی لەمێژووی بزوونەوەی کرێکاری جێهێشتووە ژمارەیـەکی زۆری ئەنـدامی هـەبووە (نـزیکـەی ٥٠ هـەزار)، بـەلام لـەڕووی ڕێکخستنەوە لاواز بووە، هەروەها ئەندامانی بیرو باوەڕو هزرییان روون نەبووە.

چەندین بزووتنەوەی شۆڕشگێری جەماوەری لەولاتانی ئەوروپا سەری هەلداوە، وەك (بزووتنـەوەی یەعقوبیـەکان) و پلانکیـەکان) لـە ولاتـی فەرەنسا، هـەروەها کۆمەلەی (خەلوزفرۆشان) لەئیتالیا و (میللیەکان) لەولاتی روسیا.

حزبە کرێکارییەکان لەئەنجامی تێکەلبوونی بزووتنەوەیەکی خۆرسکی کرێکـاران بەسوسیالستی زانستیانە سەریان هەلداوە، ئەو حزبانـە لەهـەولی بلاوکردنـەوەی بیروباوەڕی سوسیالستی و گەشەپێدانی گیـانی یـەکرِیزی و پـەروەردەو هۆشیاری بوونە لەناو کرێکاران.

کۆمەلەی کۆمۆنیستەکان (١٨٤٧ — ١٨٥٢) کەلەلایەن مارکس و ئەنجلز دروست کـرا یەکەم ڕێکخراوی کرێکاری بووە، ئامانجی ڕێکخستنی کرێکاران و بەدەست گرتنی دەسەلات بووە.

حزبەکرێکارییـــەکان (مـــارکس — لینینـــی ) جیـــاوازن لەهـــەموو حزبـــە کرێکارییەکانی تر لەڕووی ئاشکرایی ئامانج و شێوازی کارکردن و ڕێکخستن.

## حزبەکان لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا: (٩)

ڕۆشنبیری و کەلتووری سیاسی ئەمریکی، کاریگەری گەورەی لەسەر چەسپاندنی سیستمی حزبایەتی و فرە حزبی لەو وڵاتەدا هەبووە دیارە لەڕووی مێژووییەوە دروستبوونی گروپی حزبی دەگەڕێتەوە بۆ دوای دروستبوونی کۆنگریسی ئەمەریکی و یەکگرتنی ویلایەتەکان، لەو سەردەمەدا دووای نووسینەوەی دەستوور و هەلبژاردنی (جۆرج واشنتۆن) وەك یەکەمین سەرۆك بۆ ئەمەریکا لەنێوان ساڵانی (١٧٨٩ – ١٧٩٧) هەر زوو ململانێ و دووبەرەکی دەستی پێکرد.
بەشێك پشتیوانی دروستبوونی دەوڵەتێکی یەکگرتووی ناوەندی بەهێزیان دەکرد لەژێر سەرکردایەتی (هاملتۆن).
لەبەرامبەردا (تۆماس جیفرسون) سەرکردەیەکی دیموکرات خواز بوو، لەگەڵ دروستکردنی دەوڵەتێکی فیدرالی بوو کە ویلایەتەکان سەربەخۆیی خۆیان لەدەست نەدەن و تاکەکانیشی ئازادبن ودژی سەرکوتکردن و زۆر داری بوو.
دەکرێت بووترێت هەر لەکۆنگرەی دارشتنی دەستورەوە گروپی حزبی لەئەمریکادا سەری هەڵدا، (جۆرج واشنتۆن) کەبەیەکێ لەپیادەکارانی سیاسەتی فیدرالیخوازەکان ناسرابوو کە چی لەدەست نیشانکردن و هەلبژاردنیدا بوونی فیدرالیخوازو دیموکراتی – کۆماریخواز (کەجیفرسون سەرکردایەتی) دەکرد بەهەند وەرنەگیرا، هەرلەبەر ئەوەش بوو بەکۆی دەنگ کرایە سەرۆك بەلام لە دوای هەلبژاردنی ئەم پیاوە بەسەرۆك لەسەر ئاستی حزبی، ژیانی سیاسی لەئەمەریکا گەشەی زیاتری بەخۆوە بینی، چونکە ململانێی هزری و کرداری (جیفرسون)ی دیموکراتیخوازو (هاملتون)ی فیدرالیخواز بەهێزتربوون و بەتەواوی لە ژیانی سیاسیدا رەنگی دایەوە لەبەر ئەوەی ویلایەتەکانی باکور بەنفوزی فیدرالیخوازەکان دەناسران زیاتر بوون و بەهێز تر بوون لەدوای خۆ

پالآوتنەوەی (واشنتۆن) بۆ سەرۆکایەتی کەسێکی تری فیدرالیخواز بەناوی (جون ئادەمز) لەنێوان سالآنی (١٧٩٧ — ١٨٠١) هەلبژێردرا.

(چۆن ئادەمز) وەك درێژەپێدەرێکی سیاسەتەکانی واشنتۆن بەردەوام بوو لەسەرۆکایەتیکردن و گرینگی زۆری بەسیاسەتەکانی دەرەوە دەداو خواست و ویستی خەلك و جەماوەری لەناو خۆدا فەرامۆش کرد کە ئەمەش بووە مایەی دروستکردنی کەلێنێکی گەورە لەسەر ئاستی ناوخۆی و بەئاسانی لەلایەن جیفرسونەوە توانرا بقۆزرێنەوە، ئەوەبوو لەرێگای کۆکردنەوەی دەنگی جوتیاران وردە بورژواو بازرگانەکانەوە لەهەلبژاردنەکانی سالّی (١٨٠٠)دا توانی جلّەوی دەسەلات بگرێتەوە دەست و بەمەش تاسالّی (١٨٠٩)دا لەسەرۆکایەتی مایەوە، بەم شێوەیە ژیانی حزبایەتی لەئەمەریکادا رێچکەی گرت و بەردەوام بوو، هەر دوو حزبی سەرەکی لەئەمەریکا لەو بەروارانە دامەزران:

١- حزبی دیموکرات سالّی ١٧٣٩ .

٢- حزبی کۆماری خواز سالّی ١٨٥٥٤

## مێژووی سەرهەلّدانی حزب لەولاتانی جیهانی سێیەم :

سەرەرای جیاوازی لەبارودۆخی سیاسی و کۆمەلآیەتی و جۆراو جۆری ئاست و پلەی پەرەپێدان و جیاوازی لەو قۆناغە مێژووییانەی کە ئەو ولآتانە پێیدا تێپەڕ بوونە، بەلآم لێرەدا خالّێکی هاوبەش و لەیەك چوو هەیە لەئاست دیاردەی سەرهەلّدانی حزبەسیاسیەکان لەڕووی ئەرك و رۆلّ و ئەو ئامانجانەی چاوەروان دەکرێت لێیان، هەموو ئەوانە گوزارشت لەچەند ئاکارێکی هاوبەش دەکەن لەنێوان ئەو ولآتانە لەمامەلّەکردن لەگەلّ ئەم دیاردەیە: (١٠)

١) درەکەوتنی حزبەسیاسیەکان لەپێویستیە سیاسی و کۆمەلایەتیەکانە، هەلقولاوی پەرەپێدان و دەرئەنجامی تایبەتمەندییەکانی ناو ئەو کۆمەلگایانە سەپاندوویەتی، هەروەك لەکۆمەلگە سەقامگیرەکاندا روویداوە، لەم ولاتانە وەك کاردانەوەیەك بووە دژ بەو دۆخە داگیرکارییە و دەست رۆییە فراوانەی بیانی کەولاتانی جیهانی سێیەم ملکەچی بوونە.

٢) دروست بوونی حزبە سیاسیەکان لەولاتانی جیهانی سێیەم لەئەنجامی بریاردان لەسەرمافی دەنگدانی گشتی و فراوان بوونی بواری دەنگدان نەبووە لەرێگای گروپ و لیژنە پەرلەمانیەکانەوە، بەلکو بەپێچەوانە ئەوە لەگرینگترین ئامانجەکانی دروست بوونی حزبە سیاسیەکاندایە.

٣) دەرکەوتنی حزبە سیاسیەکان لەولاتانی رۆژئاوا، لەگەل فراوان بوونی بەشداری کردنی سیاسیەنەو مافی دەنگدانی گشتیەوە لەهەلبژاردنە پەرلەمانیەکانەوە هاتووە، ئامانج لەپێکهێنانی حزب بەکورتی ئامرازێکی نموونەییە بۆ راپەراندنی ئەو ئەرکە.

بەلام ئامانج لەدروست بوونی حزبی سیاسی لەجیهانی سێیەم بەشێوەیەکی گشتی، خەباتکردنە لەپێناو کۆتایی هێنان بەباری داگیرکاری بیانی و بەدی هێنانی سەروەری سەربەخۆیی نیشتمانی و دروست کردنی دەولەت و داکۆکی کردنە لەسەر ناسنامەی نەتەوایەتی.

## ٤) ئاکارەکانی سەرهەلدانی حزبەسیاسیەکان لەولاتانی جیهانی سێیەم:

أ) بەزۆری حزبە سیاسیەکان لەجیهانی سێیەمدا بوونی بەرنامەو پرۆژەی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی روون لەدەست دەدات، لەکاتێکدا ئەم مەرجە لای حزبە سیاسیە رۆژ ئاواییەکان کارێکی بەلگەنەویستە، هۆیەکەش بۆ سەرقال بوونیان دەگەرێتەوە بەخەبات لەپێناو ئازادی و سەربەخۆیی نیشتمانی.

ب) چەمکی حزب لەوڵاتانی جیهانی سێیەم هەمان ئاماژەو مانای حزبی نەبووە لەڕووی ستراکتوورو ئەرك و توخمەکانی تری کە چەمکی حزب لەوڵاتانی ڕۆژئاوا هەیەتی، بۆیە ناولێنانی کۆمەڵ و گروپە میللیەکان بەووشەی حزب لەراستیدا وەك شتێکی فۆرمی مایەوە.

ج) ناکرێ ڕۆلی دەسەلاتدارییە ئیستعماریەکان لەبیربکەین لەدورستکردنی چەندین حزبی سیاسی سەربەخۆی ئەنجامدانی چەند ڕۆلێك کەپێیان سپێراوە.

٥) حزبە سیاسیەکان لەوڵاتانی جیهانی سێیەم بەرەو ڕووی ڕەخنە گرتنی زۆر بوونەتەوە لەلایەن توێژەران کە دەکرێت ئەو ڕەخنانە لەسێ تەوەردا کۆبکەینەوە :

أ) ئەو حزبانە جۆرێك شێواویان پێوە دیارە جیاوازە بەشێوەیەك لەشێوەکان لەمانای ڕاستەقینەی حزب.

ب) ئەو حزبانە تەمەن کورتن، لەبەر ئەوەی بوونیان بەستراوەتەوە بەرکێکی دیاریکراو.

ج) ئەو حزبانە لاوازن، لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە بێ توانان، ڕێکخستنیان پوچەلە.

٦) **حزبە سیاسیەکان لە وڵاتانی عەرەبی لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا سەریان هەڵداوە بۆ نموونە** (١١)

أ) یەکەم حزب لەوڵاتی میسر دامەزرا لەساڵی (١٨٨١) کە ئەویش حزبی نیشتمانیە بە سەرکردایەتی (احمد عرابی)، لەئامانجە گرینگەکانی زرگاربوون لەدەسەلاتداری بیانی و دامەزراندنی حکومەتێکی دەستووری.

ب) لەوڵاتی تونس حزبی (تونس الفتاة) دامەزرا لەساڵی (١٩٠٧)، بانگەوازی بۆ سەربەخۆیی دەکرد.

ج) لەعێراق دامەزراندنی حزبی سیاسی ڕێگای پێ نەدەدرا بەپێی یاساکانی دەوڵەتی عوسمانی، پاش دامەزراندنی حزبی (اتحادو ترقی) ساڵی (١٩٠٨) لە وڵاتی تورکیا، لقێکی ئەو حزبە لەعێراق دروست بوو، لەساڵی (١٩١١) حزبێکی تر لەتورکیا پێکهات لەژێر ناوی (الحزب الحر المعتدل) لقێکی ئەو حزبەش لەبغداد پێکهات.

٧) لە وڵاتانی ئاسیا، حزبی (کۆنگرەی) هیندی بەدەرکەوت لەکۆتایی سەدەی (١٩) هەروەها لەوڵاتانی چین حزبی (کومینتانگ) دروست بوو.

٨) **سەرهەڵدانی ریکخراوی سیاسی لەکوردستان** : (١٢)

حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکان لەکوردستاندا بەرهەمی پرۆسەیەکی یەکگرتن و کار لە یەککردنی سیاسیانەی ڕێکخراوو کۆمەڵەو حزبە کوردییەکان بوون لەماوەی مێژووی نوێی کورددا.

هەر لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا چەندین کۆمەڵەو ڕێکخراوو یانەی رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و سیاسی لەکوردستان پێکهاتوون.

لەکوردستانی (تورکیا) باکور یەکەم کۆمەڵە لەژێرناوی (یەکێتی و بالا بوون) دامەزرا لەمانگی مایسی ١٨٨٩ز، بەبەشداریکردنی کوردەکان لە دامەزراندنی.

لەکوردستانی (عێراق) باشور لەمانگی تمووزی سالی ١٩٣٢ کۆمەڵەیەکی نهێنی لەژێر ناوی (کۆمەڵەی کوردستان) لەشاری سلێمانی دامەزرا بە سەرۆکایەتی (مستەفا پاشای یاملکی) لەو قۆناغەدا ئامانجی کۆمەڵ پشتگیریکردنی شێخ محمود بووە.

لەئێران لەماوەی شۆڕشی دەستووری، لیژنەیەك لەشاری مەهاباد پێکهات لەژێرناوی (لیژنەی بەرگریکردن لەدەستوور).

لەکۆتایی سییەکانی سەدەی بیستەم لەکوردستانی (ئێران) ڕۆژ هەلاّت ڕێکخراوێك لەژێرناوی (حزبی ئازادیخوازانی کوردستان) دامەزرا بە سەرۆکایەتی دکتور عزیز زەندی.

بەم جۆرە حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکان لەگەڵ پەرە پێدانی کۆمەلگە و گۆڕانی قۆناغەکان پەرەیان سەندو حزبی سیاسی نوێ دروست بووە.

## تیۆرەکانی دەرکەوتنی حزبە سیاسیەکان.

گرینگترین ئەو تیۆرانەی کە لەرەچەلەکی حزبە سیاسیەکان دەکۆڵنەوە بریتین لە : (١٣)

١- **تیۆری بونیاد گەرایی:**

ئەم تیۆرە لەژێر ڕۆشنایی بونیادی کۆمەلگا بەدوای رەچەڵەکی حزبە سیاسیەکان دەگەڕێت، هەندێ مەسەلەی وەك ڕێبازەکانی ئابووری و ڕێز بەندی چینەکان بەبزوێنەری سەرەکی گەشەکردنی بزووتنەوە حزبیەکان و پێشکەوتنیان دەزانێت.

٢- **تیۆرەکانی ڕێکخستن:**

ئەم تیۆرە لەرەچەڵەك و سەرهەڵدانی حزبەکان دەکۆڵێتەوە لەچوار چێوەی ڕێکخستندا.

٣- **تیۆری کۆمەڵناسی و سایکۆلۆژی:**

ئەم تیۆرە لەگۆرانە کۆمەلاّیەتی و سایکۆلۆژییەکان و ئەو ڕۆڵەی لە دەرکەوتن و گەشەسەندنی ئەم بزووتنەوانە دەیبینن دەدوێت.

## بەکورتی :

توێژینەوەکان لەدیدگای جۆراو جۆرەوە باس لەچوار تێروانینی جیاواز دەکەن بۆ سەرچاوەی ئەم حزبانە، هەریەکەیان دەتوانێ بەشێك لەپرۆسەی دروستبوونی حزبە سیاسیەکان ئاشکرا بکات، ئەم بۆ چوونانە بریتین لە: (١٤)

**١) تێروانینی دەزگا گەرا**

بەردی بناغەی ئەم بۆ چوونە لەلایەن (موریس دوفرجیە) دانراوە، کە دەڵێ یەکەم حزبی سیاسی لەرۆژ ئاوادا لەناو ئەنجومەنەکانی یاسا داناندا و لەدەرئەنجامی سروشتی بەگشتی بوونی مافی دەنگدان و بەهێز بوونی پەرلەمانەکانی دروست بوون.

**٢) تێروانینی مێژوویی:**

لەسەر پێکداداان و ناکۆکیە مێژووییەکان لەرەوتی گەشەکردنی سیاسی کۆمەڵگا جۆراو جۆرەکان بنیات نراوە.

**٣) تێروانینی گەشەخواز:**

ئەم بۆچوونە پێی وایە حزبە سیاسیەکان زادەی پرۆسەی نوێگەرایین و لەهەناوی گەشەی نوێگەرایدا سەریان هەڵداوە .

**٤- تێروانینی کارکرد گەرایان:**

ئەم بۆچوونە دەڵێ ئەو دەزگایانەی لەناو کۆمەڵگەدا بوون، توانای ئەنجامدانی کارکردە نوێکانیان نەبووە، حزبە سیاسیەکان لەرەوتێکی سروشتی بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پێداویستیانە دروست بوون.

# باسی سێیەم

## چەمك و پێناسەی حزبی سیاسی

أ) کۆمەڵناسە کلاسیکیەکان مەبەستیان لەزاراوەی – ڕێکخراو – کۆمەڵگە گەورەکان بووە، ئەو بۆ چوونە تایبەت بووە بەتوێژینەوەکانیان، پاشان هەموو گروپ و کۆمەڵە کۆمەڵایەتیەکان کەوتۆتە بازنەی بۆ چوونەکانیان بەرەچاوکردنی جیاوازی قەبارەیان. (١٥)

(ئۆگست کۆنت) پێناسەی ڕێکخراو دەکات بەوەی جۆرێك لەڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی گشتیە، باوەڕی وابووە کە هێزی حکومەت لەڕێکخراوە کۆمەڵایەتیە جۆراو جۆرەکانەوەیە.

(هربرت سبنسر) زاراوەی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی بەکار دێنێ لەکتێبەکەی (بنەماکانی کۆمەڵناسی) بەمەبەستی پەیوەندییەکانی نێوان سیستمەکانی کۆمەڵگە، وەك پەیوەندی سیستمی سیاسی بەسیستمی ئابووری و ئاینی ...

(ئەمیل دورکەهایم) لەکتێبەکەی (خۆکوشتن) زاراوەی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی بەکاردێنێ بەمەبەستی (تەواوکاری کۆمەڵایەتی لەنێوان بەشەکانی کۆمەڵگەو یاسادا کە ڕێککەوتنی کۆمەڵگە لەسەر شێوازی دیاریکراوی بەهاو ڕەوشتەکان دیاری دەکات.

بەڵام بەکار هێنانی سەردەمیانە بۆ ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی لەوە تێپەڕ نابێت کە تەواوکاری بەشەکانی کۆمەڵ بگرێتەوە، چەند بێت قەبارەیان.

ب) چەمکی حزب لای بەشێکی زۆری نووسەرو توێژەوە ڕۆژئاواییەکان بەستراوەتەوە بەدیموکراسیەت و دەسەڵاتی پەرلەمان بەپێی بۆ چوونی لیبرالی بۆ حزب و تێکڕای ئۆرگانە سیاسیەکان لەکۆمەڵگەدا.

ئەو حزبەی متمانەی جەماوەر بەدەس بێنێت و دەنگە کانیان وەربگرێت و دەسەڵات بەدەس بگرێت بەدەسەڵاتداری شەرعی دادەنرێت. (١٦)

شیرکردنەوەی چەمکی حزب لەدیدی ئەو نووسەرو توێژەرانەی کە ئایدیۆلۆژیا دەکەنە سەرچاوە بۆ ڕۆڵ و فەرمانی حزبە سیاسیەکان بواری تری هەیە.

چەمکی حزب لای حزب و ڕێکخراوە کۆمونیستەکان بریتیە لەپێشڕەوی چینە زەحمەتکێشەکان کەهەوڵی لەناو بردنی چەوساندنەوە دەدات بە هەموو شێوەکانی.

هەندێ لەتوێژەرانی بابەتی حزب لای بزووتنەوە ئیسلامیەکان، چەمکی حزب دەبەستنەوە بەئایین بەو هەندەی کە ئیسلام کۆکەرەوەی هاوبەشە لەنێوان هەموو ئەوانی پەیوەندییان پێوەی هەیە بەهەموو نەتەوەو چین و ڕەگەزەکان.

بۆیە چەمکی حزب هەر لەسەرەتای بڵاو بوونەوەی دیاردەی حزبە سیاسیەکانی وەك یەك لەپێکهاتەکاراکانی سیستمە سیاسیەکان لەسەدەی نۆزدەوە تا ئەمڕۆ زنجیرەیەك گۆڕانی گەورەو فراوانی بەسەردا هاتووەو بەتایبەتی هەر لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە کە جیهان بەرەو ڕووی بڵاو بوونەوەی ڕێکخراوو حزبە سوسیالستیەکان بۆتەوە، هەروەها دروست بوونی حزب و ڕێکخراوە رزگاری خوازی نیشتمانیەکان لەوڵاتانی جیهانی سێیەم.

پێناسە کردنی حزب پشت بەرۆژگاری پێویست دەبەستێت، هەر ڕۆژگارێك پێناسەی تایبەتی هەیە بۆ زاراوەی حزب و چەمکی حزب.

ج) پێناسەکان بۆ حزب سیاسی جۆراو جۆرو زۆرن، دەکرێت چەند تەوەرێکی سەرەکی دیاری بکرێت کەلەماوەیدا پێناسەی حزبی سیاسی بدۆزرێتەوە.

**١- تەوەری هزری لیبرالی : (١٧)**

ئەم هزرە بایەخ بەلایەنی کرداری یان ئامانجی کۆتایی پرۆسەی سیاسی دەدات کە حزب پێی هەڵدەسێت، بەرنامەی سیاسی حزب ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕێت لەقۆناغی دامەزراندنی، چونکە کار بۆ هێنانەدی گونجاندن دەکات لەنێوان کۆمەڵە کەسانێکی جیاواز تالایەنە ڕێکخراوەییەکەی بەهەند وەردەگیرێت پاشان.

بۆیە شارەزای فەرەنسی (بنیامین کونستانت) پێناسەی حزب دەکات بە (کۆمەڵە کەسانێك یەك ڕێبازی سیاسیان هەیە) .

هەروەها (ئەندریە هوریو) پێناسەی حزب دەکات کە (ڕێکخستنێکی هەمیشەییە لەسەرئاستی نیشتمانی و ناوچەیی دەجولێت لەپێناو بە دەست هێنانی پشتگیری میللی، بۆ ئەوەی بگاتە دەسەڵات بەمەبەستی جێ بەجێ کردنی سیاسەتێکی دیاریکراو) .

**٢- تەوەری هزری سوسیالستی – مارکسی :**

ئەم هزرە چەمکی چینایەتی بەرز کردەوە بۆ حزب بە شێوەیەکی تایبەت، لەبەر ئەوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی حزب و پەیوەستیە ئابورییەکانی ئەندامانی لەگەل ئەو پلەو پێگانەی بەدەستیان هێناوە لەناو کۆمەڵ جێگای گرینگی پێدانە.

بۆیە بەپێی پێناسەی (سلیس) حزب بریتیە لە :

کەرتێکی پێشەنگە لەچینێك، ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندییەکانیانە، ڕابەرایەتیان دەکات بەرەو ئامانجێك (یان ئامانجەکانیان) بەڵام لینین باوەڕی وایە کەحزب چەمکی پێشەنگی شۆڕشگێڕانەی وەرگرتووە (پێشەنگێکی ڕێکخراو) بۆیە بایەخ بەخۆ تەرخانکردنی ئەندام بۆکاری شۆڕشگێری و ڕێکخستن دەدات.

٣- مەبەست لەزاراوەی حزب لەدەق و کەلەپوری ئیسلامی (هەر کۆمەڵێك خواست و کارەکانیان دەربارەی هەر شتێك کۆ ببێتەوە، مەرج نیە ئەو کۆمەڵە سیاسی بێت ئامانجی گەیشتن بێت بە دەسەلاّت.

حزب لەدەق و کەلەپوری ئیسلامی وا پێویست ناکات کە کۆمەڵێك لەیەك ڕێکخستندا بەشداری بکەن و یەك سەرکردایەتیان هەبێت.

بەلاّم لەهزری سیاسی سەردەم، مەبەست لەحزب کۆمەڵێکی ڕێکخراو یەك ئامانج و یەك هزرو یەك ڕێکخستن کۆیان دەکاتەوە.

د) چەند پێناسەیەکی جۆراو جۆر بۆ حزبی سیاسی، لەچەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە:

١) حزب بریتیە لەو بەشەی زیاتر کاراو ڕێکخراوە لەچینێك یان توێژێك حزبە سیاسیەکان بوونیان بەستراوەتەوە بەدابەش بوونی کۆمەڵگە بەچەند چینێك و نەگونجاندنی ئەو چینانە لەنێوان خۆیاندا لەبەر چەندین هۆکاری جیاواز لەبەرژەوەندییەکانی چین و ئەو گروپانەی کۆمەڵگەی لێ پێك دێت.

حزبە سیاسیەکان گرینگترین ئامرازی ئەو چینانەن کە بەکاریان دەهێنێ لە خەباتدا لەپێناو بەرژەوەندییەکانیان (١٨).

٢) ڕێکخستنێکە کۆمەڵە کەسانێك دەگرێتە خۆی، هەلگری هەمان دیدگای سیاسین کار بۆ ئەوە دەکەن بیروباوەرەکانیان بخەنە جێگای جێ بەجێکردن، بەکارکردن لەیەك کاتدا بۆ کۆکردنەوەی گەورەترین ژمارەی هاولاّتیان لەریزەکانیان بۆ بەدەسگرتنی یان بەلای کەم کارتێکردن لەبریارەکانی دەسەلاّت. (١٩)

٣) حزبی سیاسی : بەمانای دەستەو گروپ و هاو ڕێباز هاتووە، بەڕێکخراوێکی سیاسی دەگوترێ کە ژمارەیەك خەڵکی هاو بیرو هاو ئامانج تێیدا کۆدەبنەوەو بەباس و چالاّکی لەکۆمەڵ هەولّی گەیشتن بەئامانجێك دەدەن کە چاکسازی کۆمەڵگای بەدوواوە بێت (٢٠)

# باسی چوارەم
## پۆلین کردنی حزبە سیاسیەکان

دەربارەی پۆلین کردنی حزبە سیاسیەکان لای توێژەران جۆرە ئالۆزییەك هەیە، یەك جۆر پۆلین کردن نیە بەهۆی جیاوازی لەپێوەرەکان و جیاوازی بیرو بۆ چوونەکان.

لێرەدا دەکرێت چەند وێنەیەکی بەرچاوی لە ئەو پۆلین کردنانە باس بکەین :

### یەکەم //

(٢١) دکتور صالح جواد و علی غالب، پشتیان بەدوو پێوەری سەرەکی بەستووە لەپۆلین کردنی حزبە سیاسیەکان، ئەو دوو پێوەرەش بریتین لە : پێکهاتەی ناو خۆیی حزب، رەگەزە بنچینەییەکانی حزب وەك (پێکهاتەی کۆمەلایەتی، ئایدیۆلژیا، ئامانجەسیاسیەکان).

بەپێی پێوەری یەکەم، حزبەکان پۆلین دەکرێتە سەر:

١-حزبە سیاسیە نا ناوەندییەکان، (حزبە لیبرالەکان لەئەوروپا)

٢-حزبە سیاسیە ناوەندییەکان. (حزبە ئایدیۆلۆژییە کۆمونیستەکان)

٣-ئەو حزبانەی پشت بە پەیوەندییە ستوونیە ناو خۆییەکان دەبەستن وەك (حزبە فاشیزمەکان).

بەلام بەپێی پێوەری دووەم حزبە سیاسیەکان پۆلین دەکرێنە سەر:

١- لەڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیەوە (بورژوازی، کرێکاری جوتیاری).
٢- لەڕووی ئایدیۆلۆژیاو ئامانجە سیاسیەکان (حزبە رادیکالیە فاشیەکان، حزبە بورژوازییە لیبرالیەکان، حزبەکانی سوسیالستی دیموکراسی، حزبە مارکسیەکان).
٣- لەڕووی فەرمان و پێگەی لەسیستی سیاسی، حزبە دەسەڵاتدارەکان، حزبە ئۆپۆزسیۆنەکان.
٤- لەڕووی پێکهاتەی ناوخۆیی (ئەو حزبانەی مۆرکێکی سەربازیان هەلگرتوو، حزبە ئۆتۆکراسیەکان، حزبە دیموکراسیەکان).

## دووەم//

لەکتێبی - کۆمەڵناسی سیاسی — پاش توێژینەوەیەکی ورد لەماوەی پەیوەندی کارەکە بەپرۆسەی هەڵبژاردنەوەو، دەکرێت حزبە سیاسیەکان پۆلین بکرێنە سەر : حزبە کارگێڕییەکان و حزبە ئۆپۆزسیونەکان.

١) حزبە کارگێرییەکان : (٢٢)

ئەو حزبانەی نزیکن لەدەسەلات، بەو واتایەی ئامادەکراون تارادەیەك و بەپێی گۆڕانە دیموکراسیەکان کە زۆرینە پێك بهێنن یاخود بچنە هاوپەیمانیەتیەکی حکومەتیەوە.

کارپێکردنی ئەو حزبانە بۆ بەرپرسیارییەتیەکانی دەوڵەت بەوەرگرتنی کاروبارە گشتیەکان، کاریگەری بەسەر وتارو ستراتیژییەتیدا دەبێت بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەگەر ئەو حزبانە پارێزگاربن یان چاکسازی، یاخود ئاراستەی چەپ یان مام ناوەندی، یان راستیان هەبێ.

٢) حزبە ئۆپۆزسیونەکان :

ئەو حزبانە کە لەناڕەزایی بوونەوە دێنە بواری کارکردن، هەوڵدەدەن بگەنە دەنگدەران لەکایەی کۆکردنەوەی ناڕەزاییەکان کەڕەنگە زمانە سیاسیەکای جۆرە هەلچونێکی پێوە دیار بێت.

حزبە کۆمونیستەکان لەرۆژ ئاوادا لەئاست چینی کرێکارو جوتیاران ئەو رۆڵە دەگێڕن.

## سێیەم//

شارەزای ناسراو (موریس دوفرجیە) لەکتێبەکەی (دامەزراوە سیاسیەکان و یاسایی دەستوری سیستمە سیاسیە گەورەکان) دەربارەی پۆلین کردنی حزبەکان دەڵێت : (٢٣)

لەنێوان دوو جۆرە حزب جیاوازییەکی بنچینەیی هەیە، ئەو دوو جۆرە حزبەش حزبی گەورە فەرمانبەران، حزبە جەماوەرییەکان.

١) حزبی گەورە فەرمانبەران:

بۆ یەکەم جار ئەم جۆرە حزبانە بە دەرکەوتن، ئەم پێکهاتەیە لەلایەن حزبە پارێزگارو لیبرالەکانی ئەو روپاو ئەمەریکا لەسەدەی نۆزدەدا باوەڕیان پێکرا حزبی گەورە فەرمانبەران (کادیران) ئامانجیان کۆکردنەوەی کەسایەتیەکانە، چەندایەتی لایان گرینگترە لەچۆنایەتی، ئەوانە لەکەسایەتیەکان دەگەرێن لەبەر چەندین هۆکاری مادی و مەعنەوی.

پەیکەری ڕێکخراوەیی ئەو حزبانە پێك دێت لە ئەنجومەنە ناوچەییەکان بەپێی سنوری بازنەکانی هەڵبژاردن.

شان بەشانی حزبە کلاسیکیەکان لەو جۆرە، حزبی زیاتر مودێرن پەرەی سەند لەسەدەی بیستەم، وەك حزبی کادیرانی ئەمەریکی کەگۆڕیانی بەسەرداهات،

بەکارتێکردنی سیستمەکانی هەڵبژاردن، هەروەها حزبی کرێکارانی بەریتانی جۆرێکی نوێی لەحزبی کادیران داهێنا.

٢) حزبە جەماوەرییەکان :

بوونیادگەری (ستراکتور) حزبە جەماوەریەکان لەلایەن حزبە سیاسیە سوسیالستەکان داهێنرا لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، بەشێوەیەکی جیاواز حزبە کۆمۆنیستەکان و حزبە فاشیستەکان گواستیانەوە، هەروەها چەند حزبێکی پارێزگاری لیبرال لاساییان کردەوە کەلەحزبی کادیرانەوە خۆیان گواستەوە بۆ حزبی جەماوەری، چەند نموونەیەك :

نموونەی سوسیالستی : حزبی کرێکارانی بەریتانیا

نموونەی کۆمۆنیستی : حزبە کۆمۆنیستەکانی رۆژئاوا

نموونەی فاشستی : حزبی فاشیستی ئیتالی و نازی ئەلمانی

## چوارەم //

لەداهێنانەکانی نووسەر (زیکموند نیومەن) حزبەکانی پۆلین کردۆتە سەر دوو جۆر : حزبی خاوەن بەرنامە، حزیی بەرژەوەند خواز. (٢٤)

حزبی بەرژەوەند خواز ، بەو حزبانە دەگوترێت کە بەرنامەو رەوشی خۆی بۆ تەریبوونی و گۆرانە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگە گۆریوەو لەگەڵ هەل و مەرجەکانی سەردەم دەیانگونجێنێت، ئەو حزبانە بەرنامەی تەواوو درێژ ماوەیان نیە بە ئاوردانەوە لەداواکاری شوێن و کات تێدەکۆشن کە رێگە چارە بۆ مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بدۆزنەوە.

حزبی خاوەن بەرنامە : حزبێکە خاوەن بەرنامەی درێژخایەن و تەواو، رێگە چارەی بنەڕەتی بۆ کێشەکانی کۆمەڵگە دەخاتە ڕوو.

## باسی پێنجەم
### ئەرك و فەرمانی حزبی سیاسی

ئەو بوارو ژینگەیەی، حزبی سیاسی کارو چالاکیەکانی خۆی تیادا ئەنجامدا، هەندێ ئەرك و ڕۆڵی بەسەردا دەسەپێنی، دیارە دروست بوونی خودی حزبی سیاسی لەپێناو ئامانجێك یان چەند ئامانجێکدایە، لێرەدا دوو فاکتەری سەرەکی ڕۆلیان لەدیاریکردنی ئەو ئەرك و ڕۆلانە دەبێت ئەوانیش ڕێکخستن و ستراکتوری حزبەکەیە.

ئەو ئەرك و رۆلانەی حزبی سیاسی پێی هەڵدەسێت دەگۆڕێ بەپێی جیاوازی هەل و مەرجی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی هەر ولاتێك و بەپێی دیاریکردنی ئامانجەکان.

**بەگشتی دەکرێت ئەو ئەرکانە لەچەند خالێك کورت بکەینەوە:**

١) کارا کردنی ژیانی سیاسی لەولاتدا و گونجاندن لەنێوان دەسەلات و کۆمەلانی خەلك، لەم رووەوە تیۆرە حزبیەکا دەبێ کاریگەریان بەسەر سیاسەتە گشتیەکاندا هەبێ .

٢- پێکهێنانی رای گشتی :

حزبەکان دەتوانن جەماوەر ئامادەو تەیار بکەن بۆ بەشداریکردن لەپرۆژەکانی بنیاتنانی ولات، لەکۆمەلگە فرەنەتەوەو فرە ئایین و کەلتور، حزبەکان رای

گشتی و هەڵوێستەکان دەربارەی پرسە نیشتمانی و نەتەوەییەکان دروست بکەن، بەم کارەیان بۆ چوونی جەماوەر لەگەڵ پرۆسەی سیاسی بەیەکەوە گرێ دەدەن.

٣- پێگەیاندنی کادیری سیاسی:

حـزب و ڕێکخـراوە سیاسـیەکان وەك خوێندنگایـەکن بـۆ پـەروەردەکردن و پێگەیاندن و هۆشیاری سیاسی کەیەکێکە لەئەرکە بنچینەییەکانی هەر حزبێك، ئەمەش بەئامادە کردنی کادیرانی حزب کەتواناو لێهاتوویی هزری و هونەرییان هەیە، بۆ بەشداریکردن لەکاروباری سیاسی و گشتی وڵات.

٤- بەشداریکردن لەهێنانەدی سەقامگیری سیاسی:

حزبـە سیاسـیەکان لـەڕێگای چـەند فاکتـەرێك وەك ئامـادەکردن و ڕەخساندنی ئایدیۆلۆژیا یان بەشداری کردن لە پرۆسیەی سیاسی یاخود هەر دوولا بەیەکەوە دەتـوانن شـەرعیەت بـۆ دەوڵـەت بهێننـەدی، هـەروەها لەهـەوڵ و پێکهێنـانی هاوپەیمانیەتی نێوان لایەنە سیاسیەکان.

حـزب ڕۆڵێکـی گـرینگ دەگێـڕێ لەبـەڕێوەبردنی ململانـێ سیاسـیەکانی نـاو کۆمەڵگـە بـەجۆرێك شـێوازی دیموکراسـیانە پێـڕەو بکـات و دوور بکەوێتـەوە لەتوندوتیژی.

٥- بەشداریکردن لەپرۆسەی هەڵبژاردنەکان و دیاریکردنی پالێوراوان.

یەکـەم ئەرکـە لەسـەر حـزب و ڕێکخـراوە سیاسـیەکان، پێویـست دەکـات چـین و توێژەکانی کۆمەڵگە هان بدرێن و ڕێنوێنی بکرێن بۆ ئـەوەی بەشـداری دەنگدان بکەن.

٦- فەرمانێکی چاودێری:

حزبـە سیاسـیەکان هۆیـەکن بـۆ فـشار خـستنە سەردەسـەڵات و چـاودێریکردنی ڕەفتـارو شـێوازی بـەڕێوەبردن، بەتایبـەتی هەنـدێ کاروبـاری وەك بـەڕێوەبردنی کارگێڕی و ئابوری، دیاردەکانی گەندەڵی، پەیوەندییە دەرەکیەکان.

٧- ئەرکە شاراوەکان : (٢٥)

أ) بەمرۆیی کردنی پەیوەندییە دەروونی و مادییەکان لەنێوان تاك و سیستمی سیاسی .

ب) دابینکردنی پەیوەندییەکانی نێوان حزب و دامەزراوە ئابورییەکان.

ج) ڕێگا کردنەوە لەبەردەم چین و توێژەکانی کۆمەڵ بۆ بەشداریکردن لەکارو چالاکیە سیاسیەکان و بەرەو سیستمی حزبایەتی.

د) بەکار هێنانی کەسانێك بۆ پرۆپاگەندەی حزبی.

٨- هوشیار کردنەوەی سیاسی : (٢٦)

یەك لەئەرکە گرینگەکانی حزبی سیاسی بریتیە لەپێگە یاندنی هۆشیاری سیاسی ئەم ئەرکە بەپلەی یەکەم پشت دەبەستێتە سەر رادەی هێزو توانای حزبەکان لەبەجێگەیاندنی ئەرکەکان و کارایی لەبواری کارکردنندا.

ئەم کارە پێویستی بەلێهاتوویی هەیە بۆ کارتێکردن لەسەر جەماوەرو کاریگەری لەدامەزراوە سیاسیەکانی ناو کۆمەلگەو جەماوەر بەگشتی.

# باسی شەشەم

## توخمە سەرەکیەکانی حزبی سیاسی

پسپۆرانی بواری سیاسەت بەشێوازی جۆراو جۆر دیراسەی حزبیان کردووە، وەك: توێژینەوە دەربارەی چەند حزبێکی سیاسی دیاریکراو، توێژینەوەی بەراوردکارانە لەنێوانیان، توێژینەوە لەسەر پێکهاتەی کۆمەلآیەتیان، هەروەها توێژینەوە لەسەر لایەنە پەیوەندارەکان بەپەیکەری رێکخستن، سەرکردایەتیەکانیان، شێوازی گەشە کردن و وەرگرتنی ئەندامانیان.

هەردوو شارەزا لەبواری رێکخراوەکان (برۆم) و (سلزنگ) لەکتێبەکەیان (کۆمەڵناسی) بەشێکی تەواویان تەرخان کردووە بۆ توێژینەوە دەربارەی ئۆرگانی کۆمەلآیەتی و پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامانیان و کۆمەلآنی تر، هەوڵی راڤەکردنی ئۆرگانیان داوە بەپێی ئاستەکانی پێکهاتنی. (٢٧)

بەراورد کردنە لەنێوان جۆراو جۆری حزبە سیاسیەکان بەو ئاراستەیەمان دەبات کە پشکنین لەسەر پەیوەندییەکان بکەین لەنێوان پێکهاتەی کۆمەلآیەتی ورێکخستن و ستراتیژییەت، گونجاندن لەنێوان ئەوسێ توخمە گۆڕاوە رێگا خۆش دەکات کە بەباشترین شێوە خسلەت و ئاکاری حزبەکان روون بێتەوە .

دەربارەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، حزبەکان هەندێکیان تارادەیەك بەئاشکرا جیاوازن، دەکرێت لێرەدا باس لەحزبە ئەمریکیەکان بکەین ئەوانی خاوەن بنکەی جەماوەرین و بەزۆری تێکەڵاو دەردەکەون تارادەیەکی گەورە.

حزبی کۆماری لایەنگرانی جیاوازن، هەڵگری ئاکاری و گوندنشینن بەڵام دیموکراسیەکان سیمایەکی ڕەگەزیان هەڵگرتووە، جەماوەری کۆمارییەکان بورژاوزیترن تا دیموکراسیەکان، هەر چەندە لەناوچەگوندنشینەکان دەنگدەری دیموکراسیەکانیش هەیە، خەڵکێکی خاوەن داهاتی مام ناوەندی و لاوازیش بۆ بەرژەوەندی کۆمارییەکان دەنگ دەدەن هەندێ لەڕەش پێست و جولەکە دەنگ بەحزبی دیموکراسی نادەن.

توخمەکانی بچینەی کۆمەڵایەتی هەر حزبێك بەس نیە بۆ ناساندنی، حزبە کرێکاریەکان توانای پاوانکردنی نوێنەرایەتی کرێکارانیان نیە، تا ئەگەر ئەو دەنگانەی بەدەستی دەهێنن لەماوەیەکی دورو درێژدا لەئەوروپای ڕۆژ ئاوا دوو لەسەر سێی دەنگەکان بێت.

سەرەڕای ئەوە سەرکردە سوسیالستەکان بەتایبەتی لەفەرەنسا بەشی زۆریان سەر بەچینە مام ناوەندییەکانن (کارمەندان، فەرمانبەران، مامۆستایان) بەڵام ئەوی پەیوەستە بەخسلەتی کرێکاری بۆ زۆربەی سەرکردەکان لەحزبی کۆمۆنیستی فەرەنساوی، ئەوە بەهۆی ڕێبازێکی مەبەستدار نەبووە ئەوەندەی دەرئەنجامی کارێکی سەر پێی بووە.

بەڵام ڕێکخستن لەحزبە سیاسیەکان دەگۆڕێت بەپێی کات و شوێن، (فیبر) باوەڕی وابوە کە یاسایەکی بەڵگەداری دۆزیوەتەوە، ڕەنگەزاڵبوونی حزبە جەماوەرییەکان بەسەر گروپ و یانە پەرلەمانیەکان مسۆگەر بکات.

بەڵام ئەگەر لەخودی هەر سستمێك ورد بووینەوە، هەست بەوە دەکەین کە جۆرەها حزب و ڕێکخراون بەپێی بنەمای جیاواز.

ئەو لایەنەی پەیوەندارە بەو ئامانجانەی حزب هەوڵی جێ بەجێکردنی دەدات، دەکرێت هەموو شێوازێك لەڕێکخستن ئەگەر لەبازنەیەکی تەسکدا بێ یان لەئاستێکی سەرەکی هەوڵی هەڵبژاردنی پالێوراوان بدات و ئەندامانی ڕێك بخات و پارێزگاری لەبوونی ئایدیۆلۆژیا بکات لەناوەندێك کەلایەنگیر بێت یان دژ.

لەهەموو بارێکدا ناکرێت ڕێکخستن لەهەر حزبێکدا بەردەوام بێت تەنها ئەگەر گەیشتە رادەی ئەوەی هەست و سۆز بووررووژێنێت و توانای هاندانی هەبێت، بۆ هاتنە ناو ڕیزەکانی و پارێزگاریکردنی ئەندامزانی بکات.

ستراتیژییەت لەحزبەسیاسیەکان پەیوەست نیە تەنها بەبنچینەی کۆمەڵایەتی بۆ ئەندامانی یان ئەو ڕێگایەی لەماوەیدا دەسەڵات و بەرپرسارییەتی سەرکردەکان ڕێك دەخات، بەڵکو گرێدراوە بەمەبەستەکانی سەرکردایەتی و پەیوەندی نێوان پرۆژەکانیان و ئەو ژینگەیەی کاری تیادا دەکەن.

ئەو حزبانەی ڕەوتێکی (تەوباویزم)ی بەهێزیان هەیە، پەرە بەستراتیژییەتێکی جیاواز دەدەن لەستراتیژییەتی ئەو حزبانەی باری دەروونی کۆمەڵگە کاریان تیادا دەکات و پەسندی دەکەن.

سەرەڕای ئەوەش دەکرێت جیاوازی لەنێوان ستراتیژییەتی حزبەکان بکرێت بەهۆی دووزنجیرەپێوەر: یەکەمیان پەیوەستە بەدەسگرتن بەسەر دەسەڵاتداو دووەمیان شێوەی بەڕێوەبردنی دەسەڵات.

لەسیستمە فرەییە نوێیەکان دەست گرتن بەسەر دەسەڵاتدا (جگە لەحزبە گشتگیرییەکان) بەمانای ئەوە دێت کە سەرەتای سەرکەوتنە لەهەلبژاردنەکان،

مەبەست لە ستراتیژییەتی هەڵبژاردنیش، نوێنەرایەتیە بۆ چەند توێژێکی فراوانی گەل. (٢٨)

لێرەدا چەند وێنەیەك بۆ توخمە سەرەكیەكانی حزبە سیاسیەكان بەرچاو دەخەین بەپێی جیاوازی سەرچاوەكان:

١) كتێبی (حزبی سیاسی لەكۆمەڵگای سەردەم) توخمە سەرەكیەكانی حزبی سیاسی لەم چەند خاڵە كۆكردۆتەوە : (٢٩)

أ) ئایدیۆلۆژیا :

ئەو بنچینە هزرییەیە كە حزبێكی سیاسی پشتی پێدەبەستێ لە نەخشەكێشانی سیاسەتەكانی و لەبەر رۆشنایدا ئامانج و بنەماو شێوازە جۆراو جۆرەكانی چالاكیەكان دیارییدەكات.

ئایدیولۆژیا رێبەری چالاكیەكانی هۆشیاری و ئاگادار كردنەوەیەو وەڵام و رێگەی چارەسەری كێشە بنچینەییە كۆمەڵایەتی و ئابووری رامیاریەكانی حزب دیاری دەكات لە ناو كۆمەڵگەدا .

ب) ئەندامیەتی :

حزب لەبنەرەتدا لەكۆمەڵە كەسانێك پێكدێن ژمارەیان كەم بێت یان زۆر لەیەك چین و توێژبن یان زۆرتر، هەر حزبێك لەهەوڵی فراوانبوونی بنكەی جەماوەرییەتی خۆیەتی .

ج) ئامانج :

ئەو ئامانجانەی حزب لەبەرنامەی خۆی دیاریکردووە ئەگەر سیاسی بێت یان ئابوری و کۆمەلایەتی و کەلتوری.

د) ئامرازو شێوازەکانی بەدەستهێنانی ئامانجەکان، دوو جۆری سەرەکی دەگرێتە خۆی: شێوازی دەستوری و شێوازی دیموکراسی.

ه) ڕێکخستن :

ئەو شێوازو پرەنسیپانەی پەیکەری ڕێکخستنی لەسەر پێکهاتوون، وەك پەیوەندییەکانی نێوان ئەندام و ئۆرگان، نێوان ئۆرگانەکانی سەرەوەو خوارەوە.

٢) لەکتێبی (الاحزاب السیاسیه فی العالم المعاصر ) (٣٠) توخمەکانی ڕێکخستنی بەم جۆرە دەست نیشان کرووە:

أ) سەرکردایەتی :

ب) ڕێکخستن.

ج) جەماوەر.

د) ئایدیۆلۆژیا.

ه) ئامانج

٣) لەکتێبی (مسألة الشخصية في كردستان – خصائص المناضل الثوري) (٣١) ئەم ڕەگەزانەی دیاریکردووە:

ا) ناوەندێتی دیموکراسی .

ب) سیستمی ڕاپۆرت و چاودێری .

ج) سەرکردایەتی بەکۆمەڵ.

د) کۆبوونەوە.

ه) دەست پێشکەری.

و) رەخنەو رەخنە لەخۆ گرتن.

ز) دیسپلینی حزبایەتی .

ح) خەبات لەپێناو ئامانجەکان.

٤) لەکتێبی (لینین وقضایا النضال التحرري)دا هاتووە: (٣٢)

حزب ئەو پۆلە پێشرەوە رێکخراوەیە بۆ چینی کرێکار، توانای کۆکردنەوەی کرێکارانی هەیە، لەکەسانی زیاتر هۆشیارو شارەزاپێکدێن، بنەماکانی رێکخستن بریتیە لە: ناوەندێتی دیموکراسی.

ئەم دەستەواژەیە ئەم خالانە دەگرێتە خۆی :

أ) ملکەچی ئۆرگانەکانی خوارەوە بۆ ئۆرگانەکانی سەرووتر.

ب) ملکەچی کەمایەتی بۆ زۆرینە.

ج) دیسپلینی خزبایەتی هاوبەش.

د) یەك سەرکردایەتی لەلوتکەدا.

ه) هەڵبژاردنی هەموو ئەنجومەنەکانی حزب لەخوارەوە تالوتکە.

و) ئامادە کردنی راپۆرتی خولی دەربارەی چالاکیەکان.

ز) مافی رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن.

ح) دیاریکردنی ئامانجە هاوبەشە چینایەتیەکان.

٥) بەگشتی دەکرێت توخمە سەرەکیەکانی حزبی سیاسی لەم خاڵە سەرەکیانە کورت بکرێتەوە.

أ) بەرنامەی سیاسی و پێڕەوی ناوخۆ.

ب) پەیکەری ڕێکخستن.

ج) سەرکرداتی .

د) جەماوەر.

# بەشی دووەم
## تیۆرو چەمکەکانی ڕێکخستن

- یەکەم / تیۆرەکانی ڕێکخستن
- دووەم/ چەمکە پەیوەندارەکان بەزاراوەی ڕێکخستن

# باسی یەکەم

## سەرەتایەك دەربارەی هزری ڕێکخستن

١) ڕێکخستن لەشارستانیە کۆنەکان جۆرەها شێوازی هابووەو بۆتە هۆی دروستکردن و جێ بەجێکردنی چەندین پرۆژەی گەورە لەپێناو هێنانەدی ئامانجە جۆراو جۆرەکانی (٣٣) شارستانیەت.

نزیکەی پێش سێ هەزار ساڵ فیرعەونەکان لەوڵاتی میسر جۆرێك لەرێکخستنی کۆمەڵایەتیان دەزانی، وەك ڕێکخستنی سوپا یان ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان سوپاو دانیشتوان .

هەمان شت لەوڵاتی چین بەدی دەکرا لەبواری ئاودێری وپرۆژەی گەورە ئەنجامدراوە.

لای رومانیەکان بەهۆی ئەو شێوازە ڕێکخستنانەی کە رۆمای کۆن بە دەستی هێنا بوون توانرا چەندین پۆرژەی گەورە جێ بەجێ بکرێت کەتا ئەمرۆ ئاسەواری ماوە.

بەگشتی ڕێکخستنە کۆنەکان کەلەناو کۆمەڵگاکانی ئەو سەردەمەدا بەدەرکەوتن ڕێگا خۆشکەر بوون بۆ دەرکەوتنی ڕێکخستنە نوێیەکان بەشێوەیەکی بابەتیانە، ڕێکخستنە کۆنەکان بەم دیاردانەی خوارەوە دەناسرێن:

أ- بایەخی بەدامەزراوە بنکەییەکان داوە لەشێوە سەرەتاییەکەی بەهۆی ناتەواو بوونی.

ب- ئـەو ڕێکخـستنانە ڕەنگدانــەوە بـوون بــۆ چـەند نموونەیــەکی وەك: سـوپا، جێگاکانی خواپەرستی، کەپشت ی بەمانـەوەو بەرنامـە تایبەتیـەکان دەبەسـتێت لەگەڵ زاڵبوونی تەواو بەسەرتاکدا.

٢) دەرکەوتنی ڕێکخستنە نوێیـەکان پەیوەسـتە بـە بزووتنـەوەی پیـشەسازی، کـە کاریگەری لەسەر زۆربەی بوارە ئابوری و کـەلتوری و سیاسـیەکانی نـاو کۆمەڵگـە هەبووە.

ڕێکخـستنە نوێیـەکان تـەنها چـەندین دروسـتکراوەی رووت نـەبووە کـە بڕێکـی گەورەی ئامێرو کەرەستەی زۆرو ئـاڵۆزو قـەبارە گـەورەی گرتبێتـە خـۆی، بـەڵکو جۆرە دامەزراوەیەك بوونە کە پەیوەندییەکانی کارکردنی تیادا یەکلانەبۆتـەوەو پەیوەندییــە مرۆڤایەتیــەکانیش لــەژێر کاریگــەری بــەردەوامی ئــەو شــێوازە ڕێکخستنەدا بووە.

ڕەنگـە بیرمەنـدی فەرەنـساوی (سـان سیمـسون) یەکـەم کـەس بـوو بـێ باسـی لـە ڕێکخستن کردبێت بە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەکانی لەگەڵ دیاریکردنی پەیوەندی و ڕۆڵی بەکۆمەڵگانوێیەکان.

زۆر لەبیرمەنــدان بایــەخیان بەشــیکردنەوەی ئــەو کێــشەو بابەتانــە دەدا کــە دەرئەنجامی شارستانیەتی پیشەسازی بوون وەك (کارل مارکس) و (مـاکس فیـبر) و (روبرت میشلز). (٣٤)

لێرەدا گـرینگترین شـت کەپێویـستە ئامـاژەی بـۆ بکرێـت ئەوەیـە کـە ڕێکخـستنە نوێیەکان هەڵگری ئاکارێك بوون پێیان دەوترێت جیاوازی یـان جیاکـاری، ئەگـەر کۆمەڵگـە کۆنـەکان یـان سـاکارەکان ئـەو فەرمانانـەیان بەیەکگرتوییـەکی تـەواو ئەنجامـدا بێـت، ئــەوا هۆکارەکــەی ملکەچــی تــەواوی ئەنــدامانیان بــووە بــۆ پێوەرەباوەکانی نـاو خێـڵ، ئـەوەیش لـەجیاتی چڕکردنەوەی ئـەو فەرمانانـە لـە یــەك بازنــەی کۆمەڵایــەتی کەخێزانــە (وەك نموونــە)، ئێــستا ئــەو فەرمانانــە

لەیەکەی کۆمەڵایەتی زۆر جیاواز ئەنجامدەدرێت، ئەو جیاوازەیەش فاکتەرێکی گرینگ پێکدەهێنێ لەگەشە کردنی شۆڕشی نوێی ڕێکخستندا، لەبەر ئەوەی لەلایەکەوە ڕێگا بەدروست بوونی یەکە کۆمەڵایەتیە نوێیەکان دەدات بەمەبەستی بە جێگەیاندنی فەرمانە پسپۆریەکان بەتایبەتی ئەوانی پەیوەندارن بەبەرهەم و دابەشکردن، لەلایەکی ترەوە ئەو یەکانە بەشێوەیەکی ئەنقەست دروست دەبن ئەوەش وا دەکات کەکارەکانیان جۆرێك لێهاتوویی باڵاتری تیادا بەدی بکرێت لەئەنجامدانی.

چەند فاکتەرێکی کاریگەر هەیە لەدەرکەوتنی ڕێکخستنە نوێیەکان، لەلایەن (٣٥) (ئیزن شرت) کۆ کراوەتەوە، لەوانە :

١- بوونی پلەیەکی بەرزی جیاوازی لەرۆڵ و پێگەکاندا.

٢- بۆ چوون بەرەو دیاریکردنی رۆڵە سەرەکیەکان بەپێی پێوەرو بنچینە جێگرو گرینگەکان.

٣- جەخت کردن لەسەر بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەپێش بەرژەوەندییەکانی هەر کۆمەڵێکی تر.

٤- زۆر بوونی ئاڵۆزی ژیان و تێکەڵاوی سیستمەکانی.

٥- بڵاوبوونەوەی ململانێ لەنێوان کۆمەڵەکان، ئەوی پەیوەندارە بە دیاریکردنی ئامانجەکان.

بەم جۆرە فاکتەرە کەلتوری و کۆمەڵایەتیەکان ڕێگا خۆشکەر بوو بۆ دەرکەوتنی ڕێکخستنە نوێیەکان، هەروەها ئەو پێشکەوتنەی کەزانستە مرۆڤایەتیەکان بەدەستیان هێنا کاریگەری گرینگی هەبووە.

بۆیە ڕێکخستن بووە جێگای بایەخ پێدانی زانستەکانی کارگێری و دەروونناسی و ئابووری و کۆمەڵناسی.

# باسی دووەم
## تیۆرەکانی ڕێکخستن

تیۆر بنەمایەکی گشتیە بۆ ڕوونکردنەوەی کۆمەڵێك ڕووداوی دیاریکراو، یان بریتیە لەچوار چێوەیەکی هزری کە کۆمەڵە ئەگەرێکی زانستیانە ڕوون دەکاتەوە لەماوەی شێوازێکی زانستیانەی گرێدراو بەیەکتر. (٣٦)

زاراوەی تیۆر (Theory) زاراوەیەکی ڕوون نیە، زانا ناتوانێت بەکاری بهێنێ بەکار هێنانێکی وردوو ڕاست لەنووسین و توێژنەوەکانی، ڕەنگە ئەو زاراوەیە ئاماژە بۆ سستمێکی ڕووت بکات کە هزرەکان بەیەکەوە کۆدەکاتەوەو یەکیان دەخات و لە دەقێکدا دایدەڕێژێت و مانای ئەو چەمکانە بەرجەستە دەکات کە زانا دەیخاتە ڕوو، کۆمەڵناسان ئارەزووی بەکار هێنانی زاراوەی تیۆر دەکەن، وەك واتایەك بۆ ئەم وشانە:

١- میتۆد.

٢- بیروباوەڕە ئاراستەکراوەکان .

٣- شیکردنەوەی چەمکەکان.

٤- ڕاڤەپاشکۆییەکان.

٥- گشتاندنە ئەزمونیەکان (بەگشتی کردن)

٦- لێوەرگرتن و یاسادانان .

٧- تیۆر بەواتای تەسکی وشە. (٣٧)

مەبەست لەتیۆری کۆمەڵایەتی، پەیوەندییەکەیەتی بەتۆژینەوە فەلسەفی و سیاسیەکان.

بۆ ئەوەی تیۆری کۆمەڵایەتی زانستیانە بێت و توانای راڤەکردنی دیاردەو پەیوەندی گۆڕانکارییەکانی هەبێت (ئەوی پەیوەستە بەبابەت و ناوەڕۆکەکان ) پێویستە ئەم مەرجانەی تیادا بەدی بێت :

١) پێویستە هزرو بنەماو چەمکەکانی تیۆرە کۆمەڵایەتیەکە بەیەکەوە گرێدراوبن و تەواوکەری یەکتربن، هیچ دژو ناکۆکیان تیادا نەبێ.

٢) پێویستە تیۆرەکە گوزارشت لەبیرۆکەیەك یان بیروباوەڕە ئاشکراکان بکات، چڕ بێت و بەدووایەکدا بێت بەجۆرێکی سستمی و لۆژیکی .

## یەکەم :

## تیۆرەکلاسیکیەکان :

تیۆرە کلاسیکیەکان بەو تیۆرانە دەوترێت کەلەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لە جیهانی رۆژئاوادا دەرکەتن، لەراستیدا هەڵدانی ناوی تیۆری کلاسیکی بەمانای ئەوە نیە کە ئەو تیۆرانە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمێکی مێژووی کۆن و کۆتاییان پێ هاتبێت و ئێستا بێ سوود بن، بەڵکو ئەو ناساندنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازە لەبیرکردنەوە کەتیۆرەکان چارەسەری کێشەکانی بواری رێکخستن پێڕەو کردوە بەشێوەیەکی گشتی.

لەراستیدا ئەو تیۆرانە لەکەش و هەوایەك سەریان هەڵدا کە فاکتەرە بابەتیەکان تێکەڵاو بەیەك ببوون لەسەروی هەموویانەوە پەرەپێدانی ئابوری سەرمایەداری و پەرەسەندنی پیشەسازییە جۆراو جۆرەکان لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا.

لەم قۆناغەدا بیرکردنەوە گەیشتە پلەی راوێژکردن و شێوازی زانستیانەو رەنگدانەوەی ئەو بیرکردنەوەیە بەسەر رەفتارە مرۆییەکاندا بەجۆرێك کە

هەوڵە زانستیەکان ڕووی لەڕوونکردنەوەی ڕەفتاری تاکەکان کرد بەپێی چەمکی زانسـتە سرۆشـتیەکان کەپێـشکەوتن و پەرەپێـدانی زۆری گرتـە بـەر لـەو سەردەمەدا.

**أ ) بزووتنەوەی کارگێری زانستیانە :** ( **فردريك تايلور** ) .

ئـەم تیـۆرە لـەنێوان سـاڵانی (١٩٠٠ - ١٩٢٠) لەوڵاتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا دەرکەوت، سەرهەڵدانی ئەم تیۆرە ڕەنگدانەوەیەك بوو بۆ بارودۆخی کۆمەڵگەی ئـەمریکا لەوماوەیـەدا لـەبواری پەرەپێـدانی پیـشەسازی و هۆیـەکانی بەرهـەم هێنان.

**ب ) تیۆری ماکس فیبر، دەربارەی بیروکراسیەت :** ( ٣٨ )

بیروکراسـیەت لەچـەمکە زمانەوانیەکەیـدا لـەدوو وشـەی لاتینـی وەرگـیراوە، بـەزمانی فەرەنسی وشـەی (بـیرۆ) بـەمانای نووسـینگە دێـت، ووشـەی (کراسـی) بەمانای دەسەڵات.

وشەکە لەچەمکە زانستیەکەیدا بـۆ جۆرێکی دیاریکراو لـەجۆرەکانی ڕێکخستن بەکار دەهێنرێت لەماوەیدا تاکەکان ملکەچی بنـەماو یاسا نوسراوەکان دەبن و پـشت بـەگروپێك لەپرەنـسیپەکان دەبەسـتن گرینگترینیـان دابەشـکردنی پـسپۆرییەو دیـاریکردنی بەرپرسـیاریە تیـە هـەروەها بـەزنجیرەکردنی دەسـەڵاتەکانە لـەپێناو چـاککردنی چـالاکی ئۆرگانەکـەو زۆر بـوونی تواناکـانی لەجێ بەجێ کردنی کاروبارەکان.

تیـۆری (مـاکس فیـبر) دەسـەڵاتی کـردە جێگـای بایـەخ پێـدانی خـۆی، چـونکە ڕێکخـستن لای مـاکس ڤیـبر بەچـەمکە بیروکراسـیەتەکەی پـشت بەشـەرعیەت دەبەستێ، هەر ڕێکخستنێکی بیروکراسی بۆ ئەوەی فەرمانەکانی بەجێ بگەیێنێ و بە ڕۆڵی خۆی هەستێت بەشێوەیەکی یەکگرتووانـە دەبێ پـشت بەشـەرعیەت ببەستێ ئەوەش باوەڕی ئەندامانی ڕێکخستنەکە دەگەیێنێ.

## ج ) تیۆری روبرت میشلز :

روبـرت میـشلز توێژینـەوەکانی ئاراسـتەی کـرداره سیاسـیەکانی نـاو ڕێکخـراوه گەورەکان کردووه، بۆیه هەوڵی داوه کە میتۆدەکەی مارکس سەر لەنوێ دروسـت بکاتەوه، بەڵام لەدەروازەیەکی زیاتر گشتگیر تـر، چونکه تێروانینێکی تـەواو بـۆ شتەکان بەرهەمی کارێکی بەهێزی فرەیی سروشتی جیاواز دەبێت.

بێگومـان گەشـەپێدانی ئـابوری فاکتـەرێکی سـەرەکیه لـەگۆڕانکاری کۆمەڵایـەتی، بـەڵام ئـەوی مـارکس لـەبیری کـردووه ئەوەیەکـه هێـزی تـر هەیـه لەبـەدیهێنانی دیموکراسیەت و سوسیالستی بۆیه بەو جۆرەی کەمارکس وێنـای کـردووه کارەکـه زۆر دژوار دەبێت.

ئەو خێزانەش هەر وەك میشلز بۆیان دەچێت بریتیه له :

١- سروشتی بوونەوەی مرۆڤایەتی.

٢- سروشتی ململانێی مرۆڤایەتی .

٣- سروشتی ڕێکخستنی مرۆڤایەتی.

یەکەم بەرهـەمی ئـەو دۆخـه ئەوەیـه دیموکراسـیەت دەبێتـه هـەڵگری دیـاردەی ئۆلیگاریشیەت بەم جـۆره میـشلز داکـۆکی لـه سـەر راسـتگۆیی میکیـاڤیلی دەکـات ئەوەنـدەی پەیوەنـداره بەسـەروەری دەسـتەی بـژاردە، هـەروەها لاوازی دەرفـەت لەبەردەم دیموکراسیەت، چونکه دژواره، بوونی کۆمەڵگەیەك دووربێت لەدابـەش بوونی نوێی چینایەتی.

لەماوەی توێژینەوەی بۆ حزبی سوسیالستی ئەلمانی هەروەك پێویستی دەکرد کـه ڕێکخـستنەکانی لەسـەر بنـچینەی دیموکراسـیەت دامـەزرابێ زیـاتر لـه هـەر ڕێکخستنێکی تـر، میـشلز گەیـشت ئـەنجامێکی گـرینگ کـه بریتیـه لـەوەی ئـەو سیستمه پیادەکراوه لەو حزبەدا ئاکارەکانی دیـاردەی ئۆلیگارشـیەتی هـەڵگرتووه، دیموکراسیەت تەنها دروشمێکه لەراستیدا بوونی نیه.

### د) تیۆری کرداری کارگێری: (٣٩)

(هزری فایول) زانایەکی فەرەنسیە، رابەرێکی هزرییە لەدانانی چەمکی تیۆری کرداری کارگێڕی، هەر خۆی دامەزرێنەری نزووتنەوەی کارگێری زانسیتە لەفەرەنسا، بیروباوەڕەکانی دەکەوێتە هەمان ڕێرەوی بیروباوەڕەکانی تایلور لەئەمەریکا لەگەڵ هەندێ جیاوازی لەنێوانیاندا.

(فایول) جەختی لەسەر لایەنی کارگێری و کاری بەرێوەبەرەکان دەکرد لەسەر ئاستە کارگێرییەکان، لەهەمان کاتدا جەختی لەسەر لایەنی مادی و هونەری و کرێکاریش دەکرد لەبنەمای پەیکەری ڕێکخراوەیی.

بیروباوەڕەکانی (فایرل) بەوەناسرا کەهەستی پێ ناکرێت و بەرجەستە نابێت هەروەها دژوارە پێواندنی ئەنجامەکانی، بەپێچەوانە بیرو بیروباوەڕەکانی تایلور هەست پێکراوو ماددی بوون و دەکرێت پێوانە بکرێن.

ئەم تیۆرو جەختی لەسەر ئەوەدە کردەوە کەکارگێری کردارێکە لەچەند رەگەزێکی بنچینەیی پێکها تووەو بریتیە لە : (پێش بینی کردن، پلان، ڕێکخستن، دەرکردنی ڕێماییەکان، چاودێری، گونجاندن.

ئەم کردارە خەسڵەت و مۆرکی بەگشتی کردنی هەیە، بەواتای ئەوەی کە رەگەزەکانی لەلایەن بەڕێوە بەرێکەوە کاری پێدەکرێت و هەرچۆنێك بێت جۆرو سروشتی چالاکی ڕێکخراوەکەی کاری تیادا دەکات.

هەروەها ئەو کردارە هەموو بەڕێوەبەرەکان لەهەموو ئاستەرێکخراوەییەکان دەگرێتەوە بەو هەندەی کەکاری کارگێریەکە لەبەر ئەوەی لەلایەن کەسانی تر جێ بەجێ دەکرێت. .

## دووەم:

### تیۆری ڕەفتاری لەڕێکخستن : (٤٠)

ئەو تیۆرانەی پاش تیۆرە کلاسیکیەکان هاتوون لەبواری توێژینەوەی ڕێکخستن و بیروکراسیەت پێیان دەوترێت تیۆرە ڕەفتاریەکان لەڕێکخستن، ئەو تیۆرانە وەك کاردانەوەیەك بوون لەڕووی تیۆرەکۆنەکان کەبایەخیان بەکێشەی ڕێکخراوە ئامێرییەکان داوەو لایەنی مرۆیی و فەرمانی ڕێکخستنیان پشت گوێ خستووە، بەرچاوترین ئەو تیۆرانە:

#### أ ) تیۆری پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکان: ( ئەلتون مایو ) :

ئەلتون مایو، یەکەم کەس بوو بانگەوازی بۆ ئاراستەی ڕەفتاری کردووە لەبواری ڕێکخستن و کارگێری، هەروەها یەکەم کەسە لەپێشەنگانی ئەم تیۆرە سەر کردایەتی تیپێکی لێکۆلینەوەو توێژینەوەی کردووە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی ئاراستەو کاردانەوە دەروونیەکان لەڕێگای سەرنجدانی هەڵس و کەوتی کرێکاران لەماوەی ڕەفتارە جیاوازەکان لەکار کردندا.

بێ گومان بەهۆی هەوڵی (مایو) و هاڕێکانی لەو توێژینەوانەدا ئاراستەی ڕەفتاری لەکارگێریدا بڵاوبۆتەوە لەبەر ڕادەی گرینگی و کاریگەری ئەو ئاراستە کەهەمووانی گەیاندە ڕادەی سەلماندن بەتایبەتی خاوەن کاروبارەکان.

بۆیە دەکرێت بوترێت کە (مایو) بەدانەری یەکەم خشتی ئەو تیۆرە دابنرێت .

#### ب) تیۆری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی ( وایت باك ) : (٤١)

ئەم تیۆرە لەلایەن (وایت باك) وە دانراوە دەربارەی ڕێکخستن، تیۆرەکە لەسێ خاڵی بنچینەیی کۆدەبێتەوە کەبریتین لە :

لەئۆرگانەکەی، لێرەدا ناتەبایی روو دەدات لەنێوان ئامانجەکانی تاك و ئامانجەکانی ئۆرگان.

بۆیە خۆ بەستنەوەی تەواو بەبیرو باوەڕەکانی تیۆری کلاسیکی، ناکۆکی و ئاسەواری نەگەتیڤانە دروست دەکات لای تاك، ناکۆکیش لەکۆتاییدا دەبێتە هۆی ململانێ، چونکە تاك لەهەوڵی ئەوەدایە ئارەزووەکانی تێر بکات و ئامانجەکانی جێ بەجێ بکات لەماوەی کارەکانی لەناو ئۆرگاندا، ئەگەر تاك (ئەندام) بەکار هێنراو سوود لەرەنجی وەرگیرا بێ بەرامبەر ئەوا دەبێتە هۆی ناکۆکی و ململانێ و لەئەنجامدا هەڵپەساردنی پەیوەندییە رێکخراوەییەکەی نێوان هەردوولا.

## د ) تیۆری تێکەڵاوی و توانەوە ( وایت باك – کریس ئوجیرس ) :

ئەم تیۆرە درێژە پێدانێکە بەتیوری پێشوتر (تیۆری ناکۆکی نێوان تاك و رێکخستنی فەرمی) هەوڵی روونکردنەوەی هۆیەکانی روودانی ناکۆکیەکان دەدات، هەروەها چۆنیەتی نەهێشتنی و هێنانەدی تەواو کاری لەنێوان ئامانجەکانی هەردوولا و چۆن تاك تێکەڵاو بەرێکخستنی فەرمی دەکەین، بۆیە بیرۆکەی بنچینەیی کە ئەم تیۆرەی لەسەر بنیاتنراوە بریتیە لە: کێشەی بیچینەیی لەژیانی رێکخراوەکان، چۆن کۆمەڵێك تاکەکانی جیاواز دەبن لەرووی تواناو ئامادەییان و تێکەڵاوی چالاکیە هەرەوەزیەکان دەبن، هەروەها بەشداری لەسەر کەوتنی ئۆرگانەکە دەکەن و ئامانجەکانی جێ بەجێ دەکەن، لەگەڵ رازی بوون و تێرکردنی ئاواتەکانیان.

تاك هەوڵدەدات ئامانجە خودییەکانی و لەهەمان کاتدا ئامانجەکانی ئەو ئۆرگانەی کاری تیادادەکات بهێنێتەدی، ئەگەر ئامانجەکانی ئۆرگانەکە هاتە دی ئامانجەکانی خۆی نەهاتەدی، لەم بارەدا تاك خۆی بەقوربانی دەزانێ، بەلام ئەگەر ئامانجەکانی تاك هاتەدی و ئەو تاکە وەك پێویست رەنجەکانی خۆی

بەکار نەهێنا بۆ جێ بەجێکردنی ئامانجەکانی ئۆرگانەکە، ئەوا تێکەڵاوی و توانەوە لەهەر دوو باردا ڕوویندەداوە، بۆیە ناکرێت بووترێت کەتێکەڵاوی ڕوویداوە ئەگەر ئامانجەکانی هەر دوولا بەئەنجام نەگات.

ڕێکخستنی سەرکەوتوو ئەو ڕێکخستنەیە کە ئامانجەکانی خۆی و ئەندامانی جێ بەجێ دەکات.

## ٥) تیۆری کارلێکردن (ولیام هوایت) (٤٣)

بیرۆکەی بیچینەیی ئەم تیۆرە پێکدێت لەوەی : ڕێکخستن بریتیە لە سیستمێکی کارلێکردنی نێوان تاکەکانی، کەبەپێی پەیوەندییەکانی نێوانیان پەیدا دەبێ، ئەو سیستمە تارادەیەکی گەورە کاریگەر دەبێ بەڕێگاو شێوازو کارراییەکانی کاری فەرمی کە ڕێکخستن بەسەر ئەندامانی ئۆرگانەکە دەیسەپێنێ، ئەو پەیوەندییانە ڕۆڵێکی کاریگەری گەورە دەگێڕێت لەجۆری ڕەفتارو پەیوەندییەکانی تاك لەگەڵ کەسانی تر .

بۆ تێگەیشتن لەڕێکخستن پێویستە لێکۆڵینەوە لەو جۆرە کارلێکردنانە بکرێت، واتا ڕەفتاری تاکەکان هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تر، هەروەها سیستمی پەیوەندیکردن چیەو ئەنجامی کارتێکردن لەڕەفتاری لایەنی تر چۆنە؟

شیکردنەوەی سروشتی کارلێکردنەکان ورادەی کارتێکردنی لەئەندامان، جۆری پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانمان بۆ ئاشکرا دەکات لەناو توێژە ئاستە جیاوازەکانی ناو خۆی ڕێکخستن و ڕادەی ڕێککەوتن و گونجاندن لەنێوانیان.

ئەم بارە پارمەتیدانێك دەبێ بۆ پێکهێنانی گروپەکانی کاری گونجاوو هێنانەدی تەبایی لەنێوان فەرمانە جیاوازەکان.

## و) تیۆری ڕەنسیس لیکرت :

بیرۆکەی بنچینەیی ئەم تیۆرە کۆ دەبێتەوە لە:

هەموو ڕێکخستنێك دامەزراوەیەکی مرۆڤایەتییە سەرکەوتنی بەندە بەو هەوڵانەی کە ئەندامەکانی دەیبەخشن، ئەم دامەزراوەیە بەچەند خسلەت و ئاکارێك دەناسرێت، خاوەن پەیکەرێکە بەهۆیەوە پرۆسەکانی سەرنجدان و پێوەری کۆکردنەوەی زانیارییەکان بەڕێوە دەچێت دەربارەی دۆخی ناوخۆی ڕێکخستن و ئەو ژینگەیەی کەکاری تیا دەکات، هەروەها پەیوەندی نێوان ڕێکخستن و ژینگەدا.

لەناو ئەو پەیکەرەدا تۆڕێکی پەیوەندییەکان هەیە بەهۆیەوە زانیاریەکان ئاڵ و گۆڕ دەکرێن لەهەموو بەشەکانی ئەو پەیکەرە، ئەو زانیاریانەش پێویستن بۆ وەرگرتنی بڕیارەکان لەلایەن ئەو کەسانەی دەسەڵاتەکانیان بەدەستەوەیە.

ئەم ڕێکخستنە سوود لەدەرامەتە مرۆییەکان، ئامێرەکان، کەرەستەو کەل و پەل، هێزی بزوێنەر، وەردەگرێت، بەهۆی ئەو دەرامەت و سەر چاوانە بڕیارە ناوخۆییەکان جێ بەجێ دەبن، لەناو ئەو ڕێکخستنەدا کردارەکانی کارلێکردن لەنێوان ئەندامان بەدی دێت بۆ جێ بەجێکردنی ئامانجەکان.

ئەوکردارانە بەستراون بەیەکەوە هەندێکیان پشت بە هەندێکی تر دەبەستن، پلەی کارلێکردن لەسەر جۆری هێزەکانی هاندان دەوەستێت کە ڕێکخستنەکان بەکاری دەهێنن، ئەگەر نەگەتیڤانە بوو پشتی بەترس بەستی ئەوا ئەنجامەکەی دژایەتی دەخولقێنی، بۆیە دەبێ پرۆسەکانی پەیوەندیکردن و وەرگرتنی بڕیارەکان تایبەتمەندی دیاریکراویان هەبێ بۆ ئەوەی بتوانن ڕووبەڕووی دژایەتی و گومان و خۆ دوور خستنەوە بوەستن لەلایەن ئەندامانەوە، پێچەوانەکەشی ئەگەر هێزەکانی وروژێنەر لەباربوون ئەنجامەکانی ئاراستەی لایەنگیری و هاوکاری دەبێ لەلایەن ئەندامانی ڕێکخستنەوە.

رێکخستن لەم بارەدا دەتوانێ پەیوەندیکردنی کارا بەدی بهێنێ و بڕیارەکانی دروست بێ و تەبایی و گونجاندن لەنێوان بەشەکانی و ئەندامانی دروست بکات.

### ز) تیۆر x (دوگلاس ماکیریجور) : (٤٤)

ئەم تیۆرە لەسەر ئەم ئەگەرانە دامەزراون :

تاکی ئاسایی بەسروشت حەزی لەکارکردن نیە، هەوڵدەدات بەپێی توانای دوور بکەوێتەوە لێی، بۆیە دەبێ ناچار بکرێت کە کاربکات تا ئامانجەکانی ئۆرگانەکە جێ بەجێ بێت، بۆیە تیۆری (X) ئامـاژە بـۆ سزادان دەکات وەك کارێك بەمەبەستی هاندانی تاك لەسەر کارکردن، لە هەمان کاتدا پاداشت بەکار دەهێنی بۆ ئەوانەی بەرهەمیان هەیە.

مرۆڤی ئاسایی پێویستی بەئاراستەکردنە بۆ جێ بەجێکردنی کارێك لە بری ئەوەی پشت بەخۆی ببەستێ، لەدوایدا وابەچاك دەزانێ کە رابەرایەتی بکرێت و بەخۆیی ئەرکی بەرپرسیاریەتی هەڵنەگرێ، هەروەها خواست و ئارەزووەکانی کەمە، پێش هەموو شتێ دڵنیایی و ئاسوودەی لاگرینگە.

### ح) تیۆری y (دوگلاس ماکریجور)

لەم تیۆرەدا بۆ چوونی ماکجریجور بریتیە لە : پێویست دەکات رێکخستن هەلی گونجاو دروست بکات بۆ ئەو ئەوەی ئەندامانی توانای جێ بەجێکردنی پێداویستیەکانیان هەبێ لە ماوەی جێ بەجێکردنی ئامانجەکان، بەوە دەوترێت بنەمای (تەواوکاری لەنێوان ئامانجەکانی تاك و ئامانجەکانی رێکخستن) بۆ ئەوەی ئەم تیۆرە بەتەواوی جێ بەجێ بکرێت، ئەم پێش نیازانە دەخرێتە ڕوو:

١- دیاریکردن و روونکردنەوەی پێداویستیە فەرمانیەکان.

٢- تاك ئازاد بێت لەکارکردن وبڕیار و دیاریکردن.

٣- دانانی ئامانجی ئاشکراو دیاریکراو، پێویست بەجێ بەجێکردن دەکات لەکاتێکی دیاریکراو.

٤- بەشداریکردن لەدانانی ئامانجەکان.

٥- بەشداریکردن لەبەدوواداچوونی ئەنجامە جێ بەجێکراوەکان.

٦- یارمەتیدانی کارمەندانی (ئەندامان) لەلایەن سەرکردەکان بۆ جێ جێکردنی ئامانجەکانیان.

### گ) تیۆری سیستمی هەرەوەزی، (شستر بارنارد) : (٤٥)

مرۆڤ بەسروشت بوونەوەرێکی کۆمەلایەتیە، دوور لەمرۆڤی تر توانای ژیانی نیە، هەر بەخۆی بەشێکە لەسستمێك و توانای گونجاندن و بەردەوام بوونی هەیە، پێویستە هانبدرێت لەسەر هاوکاری بۆ ئەوەی کارەکەی بەرهەمدار بێت. مرۆڤ گرینگترین توخمەکانی رێکخستنە پێویست دەکات خواست و ویستی هاوکاری لا دروست بکرێت، بەشێوەیەکی گشتی (بارنارد) ئاشکرای کرد کە هاوکاری کردنی تاك پێویستە لەباوەرپێکردن و خواستەوە بێ، لەبارێکدا ئەگەر:

١. هاوکاری گرینگ بێ و مۆرکی گرینگی هەلگرتبێ.
٢. بەبۆ چوونی (بارنارد) هاوکاری لەبەرژەوەندی رێکخستندایە لەگەڵ ئامانجەکانی یەك دەگرنەوە، هەروەها لەگەڵ بەرژەوەندی کەسایەتی.
٣. ئەگەر زانراکە هەولی هاوکاری کردن پێویستی بەدەنگەوەهاتن هەیە لەناو خودی توانافسیۆلۆژی و دەروونیەکانەوە .

## ی ) تیۆری وەرگرتنی بڕیارەکان ( هربرت سیمون ) :

بەتێڕوانینی (سیمون) ڕێکخستن پێك دێت لە :

پەیکەرێکی فەرمی پەیوەنـدی و کارلێکردنـەکان کەلـەنێوان ئەنـدامان ڕوودەدات لەماوەی کردارەکـانی پەیوەنـدیکردنی بـەردەوام، بـەهۆی ئـەو کـار لەیککردنـەوە هـەر ئەنـدامێك رادەیـەکی گـەورەی زانیـاری و بـۆ چـوونەکان بەدەسـت دێنـێ و یاریدەدەری دەبێ لەوەرگرتنی بڕیار.

لەناوپەیکەری ڕێکخستنی ئۆرگانەکەو لـەماوەی ئاسـتە کارگێڕییـەکانی کـە لێـی پێکـدێت، چـەندین ناوەنـدی هەیـە بـۆ بڕیـار دانـی فـەرمی کـەمافی وەرگرتنـی بڕیـاری هەیـە، ئـەو دەسـەڵاتە پێـی دەوترێـت دەسـەڵاتی جـێ بـەجێکردن و بڕیارەکانی پابەنـد دەبـێ بـۆ ئـەوانی تـر، هـەروەها لەشـان دەسـەڵاتی فەرمیـەوە دەسەڵاتێکی ڕاوێژکاری هەیە، بڕیارەکانی ناچاری نین کـە پابەنـدی پێوەبکرێـت، بەڵکو بڕیارەکانی لەسەر شێوەی ڕێنمایی و ئامۆژگاری دەبێ.

(سـیمون) داکـۆکی لەسـەر ئـەوە دەکـات کـە ڕوودانـی کارلـە یـەککردن لـەنێوان ئەنـدامانی ڕێکخـستن پێویـستی بـەهاوکاری نێوانیـان هەیـە، بۆیـە بـەهۆی پەیوەندی و هاوکاریکردن کار لە یەککردن ڕوو دەدات.

# سێیەم
## تیۆرەکانی ڕێکخستنی نوێ

ئەم سەردەمە بەشەپۆلی گۆرانکاری ناسراوە، کەپێشتر وێنەی نەبووە، هێزەکانی گۆڕان سیستم و پەیکەرە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی داپۆشیوە، هەروەها بەکۆمەڵ داهێنانی تەکنۆلۆژی بەدەرکەوتن کە بەکۆبوونەوەیان شۆرشێك لەزانیارییەکانی پێشکەش بەجیهان کردووەو بووەبە هۆی گۆڕانکاری لەکۆمەڵگەی پیشەسازییەوە بەرەو کۆمەڵگەی زانیاری.

**گرینگترین فاکتەرەکانی گۆڕان بریتین لە :**

١- گۆڕان لەتەکنۆلۆژیای ساکارەوە بۆ تەکنۆلۆژیای ئاڵۆز.

٢- گۆڕان لەئابوری نیشتمانیەوە بۆ ئابوری جیهانی.

٣- کردنەوەی دەرگا لەلایەن وڵاتانەوە لەبەردەم ڕێکخراوە فرەرەگەزەکان.

٤- بەرزبوونی بەهاو چەمکە باوەکان لەسیاسەت و ئابووری و کۆمەڵناسی لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمەڵگەیەکی تری نوێ هەڵگری بەهاو داب و نەریتی پەرەسەندوو.

هەموو ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و ئابووری و تەکنۆلۆژیانە کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەر ئاراستە هزرییەکانی کارگێری و ڕێکخستن:

ا) تیۆری سیستم: (٤٦)

تێروانینی ئەم تیۆرە بۆ ئۆرگان بەم جۆرەیە: سیستم پێکهاتەیەکە لەچەند بەشێکی بەستراو و کار لەیەککردوو، هەندێکیان پشت بەهەندێکی تریان دەبەستن، هەموویان هەوڵدەدەن ئامانجی ئەو سیستمەی لەبازنەیدا کاردەکەن بێتەدی، دەکرێت بەشەکان بناسرێن ودیاری بکرێن بەهۆی پەیوەندییەکەی بەو ئامانجەی کە سیستم هەوڵی جێ بەجێ کردنی دەدات، ئەو سیستمە لەبازنەی سیستمێکی گەورەترو فراوانتر کار دەکات و پێی کاریگەر دەبێت کە ئەویش کۆمەڵگەیە.

ب) تیۆری هەڵوێست : (٤٧)

هیچ تیۆرێك یان شێوازێکی کارگێڕی نموونەیی نیە، یاخود سەرکردایەتیەك چاکتر بێت لەوانی تر، کە بکرێت بەکار بهێنرێت لەهەموو هەڵویست و دۆخەکاندا، ئەوەی بڕیار لەسەر بەکارهێنانی چەمکێ یان شێوازێك یان تیۆرێکی دیاریکراو دەدا نەك ئەوانی تر، سروشتی ئەو هەڵوێستە یان دۆخەکەیە، بۆیە بەڕێوەبەرەکان ئازاد نین لە بەڕێوەبردنی ڕێکخراوەکانیان، هەموو کارگێڕییەك بەندە بە سروشتی ئەو بارودۆخە یاخود ئەو هەڵوێستەی هەیە لەو کاتەدا.
لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کارگێڕی بەپێی هەڵوێست دەبێت و لەسەر بنچینەی نەبوونی جێگیری لەم بوارانەدا: (٤٨)

١- نەبوونی جێگیری لەکەسایەتی مرۆڤدا.

٢- نەبوونی جێگیری لەرەفتاری مرۆڤدا.

٣- نەبوونی جێگیری لە رەفتاری کۆمەڵدا.

٤- نەبوونی جێگیری لە فاکتەرە ژینگەییەکان کە ئۆرگانەکەی تیادا دەژی.

٥- نەبوونی جێگیری لەکارلەیککردنی سیستمە لاوەکیەکانی ناو سیستمی گشتی.

ئەو هەل و مەرجەی لەو خالانە دیاریکراون دەبێتە هۆی ئاشکرا کردنی ئەوەی کە هەر هەلۆیستێك یان بارێك، دەبێ دۆخی تایبەتی و خەسلەتی دیاریکراوی هەبێ، بۆیە پێویست دەکات کەهەموو ئۆرگانێك ئامرازو شێوازی تایبەتیەکانی بەکاربهێنێ بۆ گەیشتن بەچارە سەرکردنی کێشەکان لەبەر رۆشنایی دۆخەتایبەتیەکانیان، بۆیە کاریگەری رێگاو شێوازە کارگێرییە جیاوازەکان بەندە بە دۆخەکانەوە لەبەر ئەوەی تیۆرێکی دیاریکراو نیە بنەمای دوروو درێژ پێشکەش بکات و گونجاو بێ لەگەڵ هەموو هەلۆیستێك یان بارو دۆخێك و لەهەموو کاتەکاندا.

ج) تیۆری کارگێری لەژاپۆن : (٤٩)

ئەم تیۆرەی ولاتی ژاپۆن لەکارگێریدا بەپیتی (j) ئاماژەی بۆ دەکرێ و کورتکەرەوەی وشەی (Japanese)ە، جۆرێك لەگونجاندنی کۆمەلایەتی دەنوێنێ لەناو ئۆرگاندا بەو شێوەیەی کە لەگەڵ بەها باوەکانی ناو ئەندامانی رێکدەکەوێت و دەگونجێت.

ئەم تیۆرە بەخسلەت و ئاکاری سەقامگیری و لەیەك چوون دەناسرێ تارادەیەکی گەورە، هەروەها بەسەلماندنی کارو رەنجی هەرەوەزی و بەکۆمەڵ کە جۆرە رەفتارەکانی تاکی تیادا تێکەڵ دەبێ لەقەوارەیەکی کۆمەلایەتی تەباو گونجاو.

تیۆری (j) تێڕوانینی بۆ کارگێری ئۆرگان بەشێوەیەکی خۆکار دەنوێنی وپشت بەچەمکی تیۆری (Y) دەبەستێ کەلەلایەن بیرمەندی ئەمەریکی (ماککریگور) وە دانراوەو لەماوەیدا کرداری رووداوەکانی تەواوکاری و گونجاندن و وێنا دەکات لەنێوان ئامانجە ئۆرگانیەکان و ئامانجی ئەندامانی، هەروەها بەدیهێنانی ملکەچی بۆی و خۆشەویستی کارو مەترسی لێی، هەموو ئەوانە لەماوەی تێروانینی ئۆرگانەکە بۆ ئەندامانی بەدی دێ تێروانینێکی بابەتی و مرۆڤانەی

بەڕێز، لەگەڵ پێڕەو کردنی شێوازێکی دیموکراسیانە بۆ سەرکردایەتی لەسەر بنچینەی بەشداریکردن و کاری بەکۆمەڵ.

خەسڵەتە گشتیەکانی ئەو تیۆرە:

١- خەسلەتی عەشائری.

٢- خۆشەویستی و تەبایی.

٣- متمانە بەیەککردن.

٤- بەرژەوەندی گشتی.

٥- دادوەری .

٦- پارێزگاریکردنی کەل و پەلی ئۆرگان.

د) تیۆری ( Z ) . (ولیام ئۆتشی) (٥٠)

فەلسەفەی ئەم تیۆرە بریتیە لەتێگەیاندنی بەڕێوەبەرەکان لەوەی کە سەرکەوتنیان لەجێ بەجێکردنی هاوکاری نێوانیان لەماوەی کاردا سەرچاوە دەگرێ بەهۆی تواناداریان لەسەر ڕێککەوتن دەربارەی کۆمەڵ ئامانجێکی بنچینەیی پەیوەندار بە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی.

هەروەها لەبەر ئەوەی پرۆسەی وەرگرتنی بڕیارەکان لە تیۆری ( Z ) بە زۆری بەبەشداری و کۆدەنگیەوە بەدی دێت، بۆیە لەکۆتاییدا بەرپرسیاریەتی تاك هەر دەمێنێتەوە.

پرۆسەی ئاراستە کردن لەئۆرگانی (Z) پشت نابەستێتە سەر دەسەڵاتی قوچەکی و چاودێرییەکی ڕاستەو خۆو ڕەفتارێکی دیاریکراو، بەڵکو پشت دەبەستێتە سەر دەسەڵاتی نافەرمی و لەسەر بنەمای چاو دێرییەکی بەکۆمەڵ و بەتاك.

ئۆرگــان لــەجۆری ( Z ) وەك عەشــیرەت وایــە چــونکە گوزارشــت لەکۆمەڵــە مرۆییــەکی گونجــاو دەکــات کــە چــالاکی ئــابوری دیــاریکراو بــەکار دەهێنــی و ئەندامانی لەماوەی چەندین بوارەوە بەیەکەوە دەبەستێت.

# باسی سێیەم

## چەمکە پەیوەندارەکان بەزاراوەی ڕێکخستن

### واتای ڕێکخستن :

ڕێکخستن بەمانا گشتیەکەی لەوە دەرناچێت کەبریتی بێت لەکارێك لەلایەن مرۆڤەوە لەماوەی مامەڵەو پەیوەندیکردن لەگەڵ کەسانی تر ، یاخود لەکاتی بەکار هێنانی کەل و پەل و کەرەستەکان بەرەچاوکردنی کات و شوێن پێداویستیەکانی ئەرك بەجێ گەیاندن و کارکردن.

لەبەر رۆشنایی ئەو بیرو رایانە چاکترین شێوازە بەکاردەهێنرێ بەباشترین بەکارهێنن یان پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامان و بابەتەکان دەستەبەر دەکات بەمەبەستی گەیشتن بەو ئامانجانەی لەسەری ڕێککەوتوون.

ڕێکخستن لەکۆمەڵگەپێشکەوتووەکان دیاردەیەکی شارستانیە پەیوەستە بە فەلسەفەو تێروانینی ئەندامان بۆ ژیان و جیهان.

گۆڤاریی بڕیاری ژمارە (١٢) بەم شێوەی خوارەوە پێناسەی ڕێکخستن دەکات لەچەمکە گشتیەکەی. (٥١)

ڕێکخستن (Organization) بریتیە لەشوێن و هەرەم و پرۆسەو ئامراز :

١- ڕێکخستن وەك شوێن:

ئەو شوێنانەی کە ڕێکخستنیان پێدەگوترێت جۆراو جۆرن: کارگە، کۆمپانیا، نووسینگە، زانکۆ، سوپا هەموو ئەو شوێنانەی مرۆڤ کاری تیادا دەکات

٢- ڕێکخستن وەك پەیکەر :

هەموو ڕێکخراوێك پەیکەرێکی هەیە وەك پەیکەری مرۆڤ، تیادا رووکاری گشتی ڕێکخراوەکەی دەست نیشان کراوە و پەیوەندییە سەرەکیەکانی روونکراوەتەوە .

٣- ڕێکخستن وەك پرۆسە :

دەتوانین سەیری ڕێکخستن بکەین وەك پرۆسەو بەجێهێنان بەمەبەستی روونکردنەوەی جوولەی ڕێکخستن، بەواتای ڕێکخستنی کۆمەڵی کاری بەرفراوان،

٤- ڕێکخستن وەك ئامراز :

بەکار هێنانی ڕێکخستن وەك شوێن و پەیکەرو پرۆسە، یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لەرێکخستن بەدانانی ئەوەی کە ئامرازێکە بۆ هاوەڵانی ڕێکخراو بەمەبەستی تێکەڵکردنی سەرچاوەکان بۆ دروستکردنێکی نموونەیی و بۆ گەیشتن بەئامانج.

دەرکەوتنی ڕێکخستن و ئۆرگانەکان بەڕاستی گرینگترین پەرەپێدان و گەورەترین دەسکەوتی هۆشیارییە کەمرۆڤی سەردەم دایهێناوە بۆ دامەزراندنی چاکترین ئایندە بەمەبەستی روو بەڕوو بوونەوەی کێشە و بەرەنگارییەکان کە هاوەڵە لەگەڵ ڕێرەوی پەرەپێدان و پێشکەوتندا لەهەموو بوارەکان.

## مەبەست لەرێکخستنی سیاسی : (٥٢)

بریتیە لە کۆمەڵە کەسانێك خاوەن یەك ئاراستەو بنەمای هاوبەش و یەك ئامانج کەرێککەوتوون لەسەر جێ بەجێکردنی، پەیوەندییەکانی نێوانیان لەسەر چەندبنەمایەکی ڕێکخراوەیی پەسندکراو دروست بووە.

هەر ئەو بنەمایانە پەیوەندییەکانیان لەماوەی کارو چالاکیەکاندا دیاری دەکات لەگەڵ دیاریکردنی شێوازی هێنانەدی ئامانجەکان.

ڕێکخستن لەسەر شێوەی حزب یان یەکێتیەك یاخود ئەنجومەنێك دادەمەزرێت لێرەدا دوو مەرج پێویست دەکات:

١. ئەندامانی ئەو ڕێکخستنە هەڵگری یەك ئاراستەو بۆ چوون بن (ئایدیۆلۆژیا) .
٢. بنەیەکی ڕێکخستن کۆیان بکاتەوە بەیەك.

## پرۆسەی ڕێکخستن :

پرۆسەی ڕێکخستن لەهەر ئۆرگانێکدا یەك لەکردارەکان یان فەرمانەکارگێرییەکان پێکدێنێ، بوارەکانی دیاریکردنی پەیوەندیەکان دەگرێتە خۆی لەناو ئۆرگانەکەدا، وەك دابەشکردنی کاروبارەکان، دیاریکردنی چالاکیەکان، دروستکردنی یەکەو ئاستەکانی دەسەلات و بەرپرسیاریەتی، بواری سەرپەرشتی کردن و سنوری ئەرك و فەرمانەکانی، پەیوەستی نێوان ناوەندە جۆراو جۆرەکان..هتد.

## بنەماکانی ڕێکخستن : (٥٣)

بنەماکان پێناسەی زۆریان بۆ دانراوە بەپێی قۆناغەکانی ڕۆژگارو قوتابخانە هزرییەکان کەلەماوەی سەدەی بیستەمدا بەدووایەکدا هاتوون.

(یورك) پێناسەی بنەما دەکات:

بنەماکان بریتین لەو گوتەزانستیانە کەدەردەهێنرێن یان پێی دەگەن لەڕێگای ساغ بوونەوەیان لەکاتی توێژینەوە لەئەزموونە مرۆییەکان لەو ئۆرگانانەی کەئەرکی ڕێکخستنی پەیوەندییەکان دەگرنە ئەستۆ بۆ ئەو ئەندامانەی کەکاری تیادا دەکەن لەگەڵ جیاوازی ئاستەکانیان.

هەندێکی تر وای دەبینن کەبریتیە لەو بابەتە و کێشە هونەریانەی بڕیار لە چالاکی تاك و ئۆرگانەکان دەدا، سەرەڕای جیاوازی و چالاکیەکانیان.

## پەیکەری ڕێکخستن : (٥٤)

پەیکەری ڕێکخراوەیی (Structure) بریتیە لەچوار چێوەیەکی دامەزراوەیی لەپێکهاتە ئۆرگانیەکان لەلق و بەش و ئاستەکانی، هەروەها ئەو پەیوەندییانەی کە دەبێ بەهۆیەوە کاریگەربن لەگەڵ ئەو چالاکیانەی کەپێی هەڵدەسن سەرەڕای بەرپرسیاریەتی و ئەو دەسەلاتانەی پێیان دەدرێت.

پەیکەری ڕێکخراوەیی بنکەیی بەستنەوەی نێوان ئەو پێکهاتانەیە، لەماوەیاندا کاروبارو ئەرکە جیاوازەکانی جێ بەجێ دەکرێت.

بەم پێیە پەیکەری ڕێکخراوەیی چالاکی و کارو فەرمانە سەرەکیەکانی ئۆرگان دیاری دەکات لەگەڵ فەرمانەکانی سەرشانی هەر ئەندامێك و پرۆسەکانی بەستنەوەو ڕێکخستن و تەواو کاری نێوان ئەو فەرمانانەو هەرکارێکی پەیوەستی تر، وەك پێداویستیەکانی دەسەلات و بەرپرسیاریەتی و زانیاری و پەیوەندییەکان و ...هتد.

پەیکەری ڕێکخراوەیی دروست دەکرێت بۆ مەبەستەکانی:

١. دابەشکردنی بەرپرسیاریەتی و دیاریکردنی ئەرکی ئەندامان و ئەنجومەنەکان بۆ هێنانە دیی ئامانجەکان.
٢. دیاریکردنی ئاستە حزبیەکان و سنوری سەرپەرشتیاری و لەدوواییدا ئاستەکانی دەسەلات و بەرپرسیاریەتیان.
٣. دیاریکردنی شێوازەکانی ڕێکخستن و ئەرکە حزبیەکان لەگەڵ یەکترو بەدیهێنانی پەیوەستی نێوانیان بۆ ئەوەی ئۆرگان وەك یەکەیەك کاربکات.

٤. دیاریکردنی کەناڵەکانی پەیوەندیکردن و گەیشتنی زانیاریەکان و چالاکیەکانی ناو ئۆرگانەکان.

## گرینگی پەیکەری ڕێکخراوەیی : (٥٥)

١. پەیکەری ڕێکخراوەیی لەپێناو جێ بەجێ کردنی ئامانجەکانی ئۆرگان دروست بووە، ئەویش لەماوەی نەخشەو پلانەکان بەو ئاراستەیەی کەلەخزمەتی ئامانجدا بێت.

٢. پەیکەری ڕێکخراوەیی یارمەتی و کارئاسانی پێشکەش دەکات بۆ جێ بەجێ کردنی بەرنامەکانی ئۆرگانەکە.

٣. پەیکەری ڕێکخستن دۆزریەوە بۆ ڕێکستنی ئەرکی ئەندامان و جێ بەجێکردنیان لەماوەی دیاریکردنی فەرمان و ئەو ئەرکانەی پێیان سپێردراوە.

٤. پەیکەری ڕێکخراوەیی ئامرازێکە بۆ ڕێکخستنی چالاکیەکانی ناو ئۆرگان لەماوەی ڕێك و پێك کردن و بەجێهێنانی پرۆسەی ئەرکەکان لەسەر هەردوو ئاستی ئاسۆیی و ستوونی.

٥. پەیکەری ڕێکخراوەیی بنکەی کارپێکردنی دەسەڵاتەکە بەپێی ئەو بڕیارەکان وەردەگێڕێن و چالاکیەکان لەئۆرگانەکاندا جێ بەجێ دەکرێن،چونکە ئاستی کارگێری و ڕێکخراوەییەکان لەگەڵ دەسەلات و بەرپرسیاریەتیان دیاری دەکات.

٦. پەیکەری ڕێکخستن بەمەبەستی ڕێکخستنی یان کەمکردنەوەی کارتێکردنەکانی تاك لە ئۆرگانەکە پەیدابووە، ئەویش لەماوەی دانانی دیسپلین سیستم وبنەماکانی جێ بەجێ کردن کەڕێگا لەهەوڵە تایبەتیەکان دەکرێت.

٧. پەیکەری رێکخراوەیی ئەو شێوازانە دیاری دەکات کەلەماوەیدا کردارەکانی چاودێری کاری پێدەکەن لەئۆرگانەکە بەهۆی دەس نیشانکردنی ئاستە چاودێرییەکان و دەزگاکانی.
٨. پەیکەری رێکخراوەیی بۆ دەستە بەرکردنی مانەوەی بەردەوامی ئۆرگان بەدیهات چونکە بنچینەی دروست بوونی ئۆرگان دەنوێنێ کە بزوێنەرو پاڵنەری مانەوەو بەردەوام بوونە.
٩. پەیکەری رێکخراوەیی دۆزرایەوە بۆ روو بەڕووبوونەوەی شاراوەیی و ئاڵۆزی و گۆران لەژینگەی ئۆرگاندا بە رێگای خولقاندنی گونجاندن لەنێوان ئەرك بەجێگەیاندنی ئۆرگان و جوڵە و پێداویستیەکانی ژینگە.
١٠. پەیکەری رێکخراوەیی جیاوازییەکانی نێوان ئۆرگانەکان دیاری دەکات لەماوەی دیاریکردنی بنچینەکانی جیاوازی ناو رێکخراوەکان بەشێوەو ناوەرۆك.

## ئۆرگان : (٥٦)

بەشێوەیەکی گشتی ئۆرگانەکان جۆرە پێکهاتەیەکن، پێناسەکردنیان جیاواز دەبێت بەپێی جیاوازی پێناسە کەران و بنەماو پسپۆرییان.

بەلاَم لەماوەی ئەو توێژینەوە جۆراو جۆرانە توانرا چوار ئاراستەی سەرەکی دیاری بکرێت بۆ پێناسە کردنیان ئەوانەش :

١- ئاراستەی کۆمەلاَیەتی Social Approach

بەپێی ئەم راستەیە ئۆرگان بریتیە لە : پێکهاتەیەك یان رێکخستنێکی کۆمەلاَیەتی، ئەم پێناسەیە وەك چوار چێوەیەکی کۆمەلاَیەتی گوزارشت لەئۆرگان دەکات، لەماوەی بایەخ پێدانی بەرێکخستنی کۆمەڵ و تاکەکان ویەکخستنی هەول و رەنجەکانیان، بەم جۆرە ئۆرگان بریتی دەبێ لە

ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی چالاك و سیستمە کۆمەڵایەتیە دیاریکراوو پسپۆڕەکان.

٢- ئاراستە ڕەفتاری Behavioral Approach

ئەم ئاراستەیە بەچاوێکی ڕەفتاریانە تەماشای ئۆرگان دەکات و پشت بەبنچینەی ڕەفتارەکانی تاك و کۆمەڵان دەبەستێت لەگەڵ کار لەیەکردنی نێوان ئۆرگان و رفتاری کۆمەڵان.

ئۆرگان گوزارشت لەکۆمەڵە ڕەفتارێك دەکات کەپەیوەندییە ناوخۆییەکانی سنوردار دەکات و بڕیار لەسەر ئاراستەکانی کاروجێ بەجێکردنی ڕۆڵی ئۆرگانەکە دەدات.

٣- ئاراستەی پەیکەری : Structural Approach

ئۆرگان بەپێی ئەم ئاراستەیە بریتیە لەپەیکەرێکی ڕێکخراوەیی بەیەك بەستراوە بنیات نراو لەسەر بنچینەی پەیوەندییە ئاڵ و گۆڕە ناوخۆییەکان، بەم پێیە ئۆرگان بریتیە لەرێکخستنی پەیکەرێك کەبەشێوەیەکی ورد جێگای کاری ئەندام و گروپەکان دیاری دەکات لەناو ئۆرگانەکە.

٤- ئاراستەی فەرمانی Functional Approach

ئەم ئاراستەیە لەو گۆشەیەوە تەماشای ئۆرگان دەکات کەبریتیە لەدەزگایەك، کۆمەڵە فەرمانێکی جۆراو جۆرو ڕێکخراو ئەنجام دەدات، بۆیە ئۆرگان بریتیە لەبەڕێوەبردنی ئەو فەرمانانەو بایەخ پێدانیان.

بەشێوەیەکی گشتی ئۆرگان ئەو کارانەی تیادا کۆ دەبێتەوە : (٥٧)

١. لەناو چالاکیە ئالۆزە مرۆڤایەتیەکانیدا چەندین ئامانج کۆدەبێتەوە.
٢. کار لەیەککردنی ئەندامان لەماوەی تۆزێك لەپەیوەندییەکانی دوور لەکەسایەتی.
٣. چەندین ئامانجی دیاریکراوو تایبەتمەندی هەیە.

٤. لەناو بازنەی سیستمە کۆمەڵایەتیە گشتیەکە چەندین سیستمی تر دەوری داوە.

٥. خزمەتگوزاری پێشکەش بەکۆمەڵەکەی دەکات.

٦. لەئەرك و بەجێگەیاندن پشت دەبەستێتە سەر ئاڵوگۆڕکردنی ئەو توخمانەی دێنە ناوی و ئەوانی دەڕۆنە دەرەوە لەگەڵ ئۆرگانەکانی تر .

## رەفتار لەناو ئۆرگاندا: (٥٨)

رەفتار لەناو ئۆرگاندا (٥) رەگەزی بنچینەیی هەیە، بازنەییەکە بۆ دیاریکردنی بوارو رەهەندەکانی، رەگەزەکانیش بریتین لە:

١. ئەندام (تاك) : کردارە خودییەکانی، وزەو هاندەرەکانی، رەفتاری تاك ئاراستە دەکات و کاری لێ دەکات.

٢. کۆمەڵ : کردەوە کارلەیەککردووەکانی، پەیوەندییەکان، فشارەکانی گروپ بەسەر تاکدا.

٣. ئۆرگان : دەوروبەروو ژینگەو گۆڕانکراییە ناو خۆییەکان کە تاك و کۆمەڵ کاری تیادا دەکەن، ئەو دیسپیلن و شێوازە رەفتاریانەی بەسەر ئەندامان دەیسەپێنێ.

٤. ژینگە : بارو دۆخەکەی، هێزی رووداوەکانی و داواکاری و بەهاو دەرامەت و پالپشتی کردنەکانی، تایبەتمەندییکانی و لایەنە پۆزەتیف ونێگەتیڤەکانی کارو تێکردنی بەسەر رەفتاری تاك و کۆمەڵ.

٥. کارتێکردنەکانی نێوان ئەو رەگەزانەی سەرەوە بەگشتی، دەرئەنجامەکانی لەرووی تەبایی و گونجاندن و یان ئاراستە کردن و گۆڕانکاری و پەرەپێدانەوە.

**سیستم** : (٥٩)

دەستەوازەی سیستم وشەیەکی یۆنانیەو بەواتای گروپ یان کۆمەڵ دێت، لەبوارە جۆراو جۆرەکانی فەلسەفی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا واتای تایبەتی خۆی هەیە.
لەڕووی فەلسەفیەوە بەکۆمەڵەبنەمایەکی جێگەی پەسندی مەزهەبێکی فەلسەفی یان زانستی دەوترێت، یان کۆمەڵە بنەمایەك کەلەلایەن زانایەکەوە پەسند کرابێ.
لەهەندێ زماندا سیستم بەمانای پێکهاتەی بەشەکان دێت، لەزانستی سیاسەتدا سیستم بەواتای ئاکاری حکومەت، لەڕووی ڕێکخراوەییەوە بەمەبەستی ڕێکخستن کاروباری ناو ڕێکخراوەکەوە دێت.

**پرۆگرام** :

بریتیە لەبەرنامەی حزبێکی سیاسی بۆ قۆناغێکی مێژووی دیاریکراو بەرەچاو کردنی بارودۆخی کۆمەڵگە لەو قۆناغە، بەرنامەکە لەکاتی گۆڕانکارییە گەورەکان یان جێ بەجێکردنی ئامانجەکان پێویست بەگۆڕان دەکات.
بەرنامەی هەر حزبێکی سیاسی بریتیە لەئامانجە گشتی و کاتیەکان، بیرو بۆچوون لە بوارەکانی سیاسی ئابوری کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری کە حزب لەپێناو بەجێهێنانی خەبات دەکات.
ئەو ئامانج و بیرو بۆ چوونانە ڕەنگدانەوەی ئایدۆلۆژیای حزبەکەیە کەلەبەر ڕۆشنایی کار دەکات.

**پێڕەوی ناو خۆ**:

بریتیە لەکۆمەڵێك بنەماو پرەنسیپ کە پێناسەو دروشم و پرەنسیپە ڕێکخراوەییەکانی حزب ڕووندەکاتەوە و پەیوەندییەکانی ناوخۆ دیاری دەکات،

بنیاتنانی هەیکەلی ڕێکخستن دەس نیشان دەکات، ئەرك و دەسەلاتی ئۆرگانەکان و مافی ئەندامانی حزب و شێوازی چارە سەرکردنی کێشەکان دیاری دەکات.

**کۆبوونەوە :**

کۆبوونەوەی ئەندامانی ئۆرگانێکی حزبی لە جێگایەکدا، کۆبوونەوەکان جیاواز دەبن بە پێی پلەی ڕێکخراوەیی ئۆرگانەکەو ژمارەو پلەو پایەی ئەندامەکانی لەکۆبونەوە حزبیەکان بەرنامەی کار ئامادە دەکرێت کە ئەو باس و کێشانە دەگرێتەوە پەیوەندی بەکارو باری ئۆرگانەکەوە هەبێ.

**کۆنگرە :**

کۆنگرە بەرزترین و بالاترینی ئۆرگانی حزبە، ئەو ئۆرگانە یان ئەو دەسەلاتە هیچ ئۆرگانێکی دیکەی حزب ناتوانێت سەرپێچی بکات، کۆنگرە لەکۆمەلێك ئەندام پێکدێت، ئەندامانی لیژنەی ناوەندی (سەرکردایەتی) و نوێنەرەکانی ڕێکخستن لەناوچەو هەرێمە جیاجیاکان لەخۆ دەگرێت، لەهەندێ حزبدا ئەندامانی لیژنەی چاودێری و پشکنین و هەروەها ئەندامانی حزب لەپەرلەماندا دەگرێتەوە بەشداربوون لەکۆنگرەو ئەندام بوون لەکۆنگرە بێ مەرج نیە، بەڵکو لەزۆربەی حزبەکان پێڕەوی ناوخۆ یان چەندمەرجێکیان داناوە بۆ ئەو ئەندامانەی بەشداری دەکەن.

ئەرکەکانی کۆنگرە زۆر و جۆراو جۆرن هەموو بوارەکانی کارو چالاکی و ژیانی حزب دەگرێتەوە.

## ئەندام :

ئەندامی حزب ئەو کەسەیە کەپەیوەندی کردووە بەیەکێك لەئۆرگانەکان، ئابوونە دەدات و بڕوای تەواوی بەبیروباوەڕو سیاسەتەکانی هەیە، ئەرك و مافەکانی خۆی بەجێ دەهێنێ، مەرجەکانی ئەندامیەتی لەحزبێکەوە بۆ حزبێکی تر جیاوازە بەپێی ئایدیۆلۆجیایەکەی.

## راپۆرت :

ئامرازێکی گرینگە بۆ خستنە ڕووی راستی و ڕووداوەکان، شیکردنەوەیان، پێش نیازەکان بۆ چارەسەرکردنیان.

راپۆرتی حزبی ئامرازێکی سەرەکی پەیوەندی نێوان ئۆرگان و دەزگا حزبیەکانە، جەخت لەسەر پەیوەندییەکی زیندووی ئەندام بەحزبەکەی دەکات.

## ئابوونەوە:

بەشداری کردنی ئەندامی حزبە بەبڕێك پارە، ئەمە وەك ئەرکێکی ئەندامیەتی لەحزبدا، دەبێتە یەکێك لەسەرچاوەکانی داهات بۆ ئەو حزبە.

## رەخنەوەرەخنە لەخۆگرتن :

رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن، بنەمایەکی گرینگە لەژیانی ناوخۆی حزب، مەبەست لەو هەلوەێستە هەلسەنگاندنی لایەنە باش و لایەنە لاوازەکانە، کەئاراستەی ئەندامان یان ئۆرگان دەکرێت.

رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن شێوازێکە بۆ فێربوون، فێربوونی سەرکردەو کادیران، رێکخراو ئۆرگان و ئەندامان، شێوازێکی پەروەردەییە، بۆ پێشختنی کاری حزبایەتی.

# بەشی سێیەم
## تیۆری ڕێکخستن و ڕەهەندەکانی

یەکەم/ تیۆری ڕێکخستن و ڕەهەندەکانی
دووەم/ کار لەیەککردنی نێوان ئەندام و ئۆرگان
سێیەم/ پەیکەری ڕێکخراوەیی و جۆری سەرکردایەتی .
چوارەم/ ڕۆشنبیری لەناو ئۆرگان
پێنجەم/ بڕیار وەرگرتن لەناو ئۆرگان
شەشەم/ ململانێیەکان و یەکلاکردنەوەیان
حەوتەم/ پەیکەری نیزامی و پەیکەری نانیزامی
هەشتەم/ کارلێکردن لەنێوان ئۆرگانەکان

# باسی یەکەم

## تیۆری ڕێکخستن و ڕەهەندەکانی

لەکتێبی (المعجم الحديث للتحليل السياسي) پیناسـەیەکی کـورتی چـەمکی تیـۆری ڕێکخستن دەخاتە ڕوو بەم دەقەی خوارەوە : (٦٠)

تیۆری ڕێکخـستن (Organization Theory) چـوار چێوەیەکی چـەمکەکانە بـۆ لێکۆڵینــەوە لەئۆرگانەکانــە، دەربــارەی ئاکارەکــانی، ڕەفتارەکــانی، ئەنــدامانی لەگەڵ ئەو لایەنە سەرەکیانەی جێگای بایەخ پێدانیەتی.

کارلێکردن لـەنێوان ئەنـدامانی ئۆرگـان و شـێوازەکانی، پەیکـەری ڕێکخراوەیـی و جۆرەکــانی ســەرکردایەتی، پێوەرەکــانی ئۆرگــان و ڕۆشــنبیریان، بڕیارەکــان و یەکلاکردنــەوەی ملاننێیــەکان، پەیوەنــدی نێــوان پەیکــەرە سیــستەمیەکان و ناسیستەمیەکان لەناو ڕێکخراوەکان، کارلێکردن لەنێوان ئۆرگانەکان.

تێوری ڕێکخستن لەزانـستی سیاسیدا بەکارهاتووە بەتایبەتی بـەمانای لێکۆڵینـەوە لەلیژنەکان، کۆمەڵە بچووکەکان و حزب و دەستە یاسادانەرەکان.

بـەورد بوونــەوە لــەو دەقــەی ســەرەوە بــۆ چــەمکی تیــۆری ڕێکخــستن، دەکرێـت ڕەگەزە سەرەکیەکان بەم شێوەی خوارەوە بخەینەڕوو :

١- کارلێکردن لەنێوان ئەندامانی ئۆرگان و شێوازەکانی.
٢- شێوازەکانی پەیکەری ڕێکخراوەیی و جۆرەکانی سەرکردایەتی.
٣- ڕۆشنبیری لەناو لەناو ئۆرگان (ئایدیۆلۆژیا).

٤- بڕیار وەرگرتن

٥- ململانێیەکان و یەکلاکردنەوەی.

٦- پەیوەندی لەنێوان پەیکەرە سیستەمیەکان و ناسیستەمیەکانی ناو ڕێکخراو.

٧- کارلێکردن لەنێوان ئۆرگانەکان.

ئۆرگان یەکەیەکی بنچینەییە لەهەر ڕێکخراوێکی سیاسی بەپێی ئاستە جیاوازەکانیشی لەچەند ئەندامێك پێکدێت و سیمای بەردەوام بوون و درێژە پێدانی چالاکی هەیە، ئامرازی بەدیهێنانی ئامانج و داواکاریەکانە.

لەراستیدا کاری ڕێکخراوەیی، بەئەنجام گەیاندنی پەیوەندییەکانە، ئەو پەیوەندییانەش ئەم بوارانە دەگرێتەوە.

١- پەیوەندی نێوان تیۆروپراکتیك، بەجۆرێك کەهیچ پسانەوەی لەنێوان لایەنەکانی ئەم هاوکێشەیە روو نەدات و بکەوینە داوی زۆروتنی بێ ئەنجام.

٢- پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی ڕێکخستن بۆ دەربڕینی هەست و ویستی هاوبەشیان.

٣- شێوازی پەیوەندییەکانی ناوڕێکخستن، سەرکردایەتی، کادیران.

٤- پەیوەندییەکانی نێوان ڕێکخستن لەگەڵ چین و توێژە جۆراو جۆرەکانی جەماوەر.

ئەم پەیوەندیانە لەیەك کاتدا بابەتی ئایدیۆلۆژی و تەکنیکی و رۆشنبیری دەخاتە روو لەسەر هەردوو ئاستی ستراتیزی و تەکنیکی، ئەم بابەتانە یەکلاکردنەوەیان لەبەر رۆشنایی پابەندبوون بەئایدیۆلۆژیاو بنەماکانی ڕێکخستن دەبێ، واتا بەهۆی رەفتاری زانستیانەی دوور لەکاری سەرپێی و

ئەزمونگەری، ڕێکخستنی سیاسی پرۆسەیەکی ئامێری نیە، بەڵکو ڕەنگدانەوەی هەڵوێستی بیرو باوەڕەکانە.

ڕێکخستن ئامرازی تیۆرە بۆ جێ بەجێکردن، کاتی هزری سیاسی باس لەکاری جەماوەری دەکات، ئەوا ڕاست نیە ڕێکخستن دوور بێت لە جەماوەر، کاتێ هزری سیاسی باس لەهەڵسەنگاندنی قۆناغەکان دەکات و دیموکراسیەت و فرەیی بەگونجاو پێویست دەزانێ، ئەوا بنەمای ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆ گرتن دەبێتە کارێکی پێویست.

لەم بوارەدا ئەگەر سەرنجێ لەگرینگی ئەرکی ڕێکخستن بدەین لەئاست حزب، دەبێ ئاماژە بۆ ئەم لایەنانە بکەین:

١- پەروەردەکردنی سیاسی و هۆشیارکردنەوەی ئۆەگانەکان و جەماوەر.
٢- ئاگادار کردنەوەی ئەندام و لایەنگران بەبڕیارو ڕێنمایی و بەرنامەکان.
٣- ئەرکەکانی لەبواری هەلبژاردنە جۆراو جۆرەکان .
٤- ئەرکی دەسەڵات گرتنە دەست و پاراستنی سیستمی سیاسی.
٥- ئەرکی پەیوەندیکردنی نێوان گروپ و لایەنە سیاسیەکان.
٦- ڕێکخستنی سەقامگیری و بەردەوامی دەستەبەر دەکات، بەمە حزبی سیاسی ئەزموونێکی گەورە لەکاری سیاسی بەدەست دێنێت.
٧- ڕێکخستن ڕەگەزی ڕێك و پێکی و پێکهاتنە، لەئەرکەکانی زاڵبوونە بەسەر پێکنەهاتن و ڕەفتاری بەرەڵلایی.
٨- پارێزگاریکردنی یەکبوونی ناوخۆیی حزب و یەك ریزی ئەندامانی، لەڕووی بیروباوەڕو ئاراستە کردنی بەرهەڵستی و دەستە گەری و دوو بەرەکی و ناحەزان.
٩- پەیداکردنی پشتگیری جەماوەری کەزەمینەی کۆمەلایەتی پتەو پێکدێنی بۆ حزب.

١٠- رێکخستن ئامرازی سەرەکی حزبە بۆ جێ بەجێکردنی ئامانج و بیروباوەڕەکانی و کەبەهۆیەوە ململانێی سیاسی لەگەڵ لایەنی رکابەر بەرێوە دەبات .

حزبە سیاسیەکان بۆ بەجێهێنانی سەرکەوتن و گەیشتن بەئامانجەکانیان پێویستیان بەدوو مەرج هەیە. (٦١)

١- ئاست و باری هزری و ئایدیۆلۆی و پەیکەری رێکخراوەیی و بەرنامەی سیاسی و دەستەی بژاردەی سەرکردایەتی، هەروەها یەکگرتوویی ناو خۆیی و هۆیەکانی پەیوەندیکردن، قەبارەی ئەندامیەتی و کاریگەرییە ناوخۆییەکان.

٢- ژینگەی سیاسی و کۆمەلایەتی و کەلتوری سەرچاوەی هزرو بنەماکانی سیستمی حزبن، کۆدەبنەوە لەسروشتی ئەو کۆت و پێوەندە یاسایی و سیاسی و کارگێرییە سەپێنراوانە بەسەریدا.

ئۆرگان یەك لەگرینگترین رەهەندەکانی حزبە سیاسیەکان پێکدەهێنێ، زۆر لە توێژەرانی حزبەکان بەتایبەتی نووسەرانی کلاسیك، ئۆرگان بەگرینگترین خاڵی جیاکەرەوەی حزبەسیاسیەکان (بەواتا نوێیەکەی) دەزانن لە رێکخراوەکانی تر.

(مورس دوفرجیە) لەو توێژەرانەیە کە گرینگی لەرادە بەدەری بەرێکخستن و پێکهاتەی دەدا، ئۆرگانی حزب بەبگۆرێکی سەربەخۆ دەزانێ بۆ رونکردنەوەو شیکردنەوەی لایەنە جۆراو جۆرەکانی حزب.

پێکهاتەی هەر حزبێك بەشێوەیەکی خۆ کرد بەدی نایێت، بەڵکو پێویستی بەدیرێکی روون و هەوڵدانێکی ئامانجدار هەیە، بەپێی ئاراستەی ئەو دیدە، کاری خۆ کردی لەرێکخستن بەکردەوە دەبێتە هۆی زاڵ بوونی چین و توێژە هەڵپەرستەکان و دەس رۆیشتووەکان.

(روبـــرت میفلـــز) لەکتێبـــە بەناوبانگەکـــەی کەلەســـاڵی (١٩١١) نووســـیویەتی، لێکۆڵینەوەییەکـــە دەربـــارەی کـــاری ڕێکخراوەیـــی لـــەحزبی سوســـیال دیمـــوکراتی ئەڵمانیا. (٦٢)

ئـــەو لەکتێبەکەیـــدا ڕێکخـــراوی حزبـــی بـــەئامرازێك دەزانـــێ بـــۆ دەســـەڵاتداری تاکڕەوانەی حزب بەسەر ئەندامەکانیداو دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە (ئۆلیگارشـی) ئاسنینی حزبی سوسیال دیموکراتی ئەڵمانیا لەئۆرگان و ڕێکخستنی ئـەم حزبـەوە سەرچاوەدەگرێ.

(میفلـــز) لـــەوە باوەڕەدایـــە کـــە ئۆرگـــان و ڕێکخـــستنی بـــەهێزو توکمـــە جگـــە لـەتاکرەوی هـیچ ئـەنجامێکی تـری نیـە و ئـەو دووانـە بەپێویـست و گرێـدراوی یەکتر دادەنرێن.

لەڕووانگـــەی (میفلـــزەوە) هـــۆی ئـــەم دیاردەیـــە زۆر ڕوونـــە چـــونکە هـــەموو ڕێکخراوەکـــان و تەنانـــەت ڕێکخـــراوە دیموکراتیـــەکانش بەئاراســـتەی جـــۆرە ئاریـــستوکراتیەك دەڕۆن لەهـــەموو ئۆرگانەکانـــدا بەناچـــار ژمارەیـــەکی کـــەم ڕێبەرایەتی و ڕێنمایی ڕێکخراو لە ئەسـتۆ دەگـرن ڕێکخـراو بـەخێرا بەسـەر دوو بەشی : باڵا دەسەڵاتداو ژێر دەست، دابەش دەبن.

(ویـل هـوفێر) ڕەخنـە لـە (میفلـز) دەگـرێ دەربـارەی تێگەیـشتنەکەی لەسـەر ئۆرگان، (ویل هو فێر) ئۆرگان بەئارمرازێك بۆ کۆکردنەوە دەزانـێ و ئـەم جـۆرە پێناسەی دەکات.

ئۆرگـــان بریتیـــە لـــەئامرازێك بـــۆ کۆکردنـــەوەی ئەنـــدامان لەگرووپـــە جـــۆراو جۆرەکاندا، بەمەسەتی ڕێکخستنی چالاکیەکانیان.

بنیادنانی ڕێکخراوەیی پشت بەسێ ڕەهەندی بەیەك گرێدراو دەبەستێ : (٦٣)

**یەکەم** // ئاڵۆز بوون :

ئەو زاراوەیە ئاماژە کردنە بۆ ڕادەی جیاوازی یان ئەو جۆراو جۆریەی کە هەیە لەناو ڕێکخستندا ئەم جیاوازییە دابەش دەبێتە سەر سێ جۆر:

أ) جیاوازی ئاسۆیی: پلەی جیاوازی لەنێوان ئەو یەکە ڕێکخراوەییانەی کە لەسەر یەك ئاستی دەسەلاتن، ئەم جیاوازییەش بەپێی ئەم ڕەگەزانە دیاری دەکرێت.

١- پاش خان و بیرو بۆ چوونی ئەندامان.

٢- ئەرکە سنوردارەکان لەرێکخستن.

٣- ئاستی ڕاهێنان و فێربوون.

ب) جیاوازی ستوونی : مەبەست لەم جۆرە جیاوازییە، ڕادەی قوڵایی زنجیرەی پەیکەری ڕێکخراوەییە، یان ڕادەی فرەیی ئاستەکانی دەسەلات لەناو ڕێکخراوەکە، چەندی ماوەی نێوان بنکەی پەیکەری ڕێکخراوەکە لەگەڵ لوتکەکەی فراوان بوو، ئەوەندە ئەگەرەکانی ئاڵۆزی وشێواندن لەپەیوەندیکردن و دژواری ڕێکخستن و وەرگرتنی بڕیارەکان زۆرتر دەبێ.

ج) جیاوازی ناوچەیی (شوێن)

لێرەدا مەبەست ڕادەی بلاوبوونەوەو دابەش بوونی جوگرافیە بۆ ئەندام وئۆرگانەکان، واتا چەندی دابەشبوونی جوگرافی کاروبارو ئەندامانی ڕێکخستن فراوان بوو، ئەوا پلەی دابەش بوون زۆرتر دەبێ، زۆربوونی ژمارەی کادیران و فراوانبوونی ماوەی نێوانیان دەبێتە هۆی ئاڵۆز بوونی زیاتر .

**دووەم** // فەرمیەتی :

واتا بوونی پێوەرێك بۆ دیارکردنی کاروبارو چالاکیە جیاوازەکانی ڕێکخستن، لێرەدا پەیوەندییەکی پێچەوانە هەیە لەنێوان بەفەرمی کردن و ئازادی هەڵس و

کەوت، چەندی پلەی بەفەرمیکردنەکە زیاتر بوو ئەوا ئازادی هەڵس و کەوت کەمتر دەبێ، جێگای ئاماژە بۆ کردنە پلەی بەفەرمیکردن جیاوازە لەرێکخراویکەوە بۆ ڕێکخراوێکی تر.

**سێیەم** // ناوەندێتی :

مەبەست لەناوەندێتی چۆنیەتی وەرگرتنی بڕیارەکانە لەناو ڕێکخستن، هەروەها پلەی دابەش کردنی دەسەڵاتەکان تیادا.

# باسی دووەم
## کار لەیەککردنی نێوان ئەندامانی ئۆرگان و شێوازەکانی

ئۆرگان چیە؟ ئاستەکانی، شێوازەکانی پەیوەندیکردن لەنێوانیان، ئەرك و دەسەڵاتەکانیان، ئەندامانی، پێوەرەکانی وەرگرتنیان، ئەرك و مافەکانیان، پەیوەندییەکانی نێوانیان، ئاستی کاریگەری نێوانیان.

ئۆرگان یەك لەپێکهاتە بناغەییەکانی پەیکەری ڕێکخراوەیی هەر حزبێکی سیاسیە لەبنکەوە تا دەگاتە لوتکەی پەیکەرەکە بەپێی ئاستەجیاوازەکانیان لەئەرك و دەسەڵاتەکان و جۆری پێکهاتنیان لەماوەی پەیوەندییەکانی نێوان ئۆرگانەکان و پلەی کارلەیەککردنیان، ڕادەی چالاکی و توانای حزبی سیاسی دەردەکەوێت.

ئەو چوار چێوەیەی شێوازی پێکهاتن و ڕێکخستن و پەیوەندییەکانی ئۆرگانەکان دیاری دەکات، پێڕەوی ناو خۆی حزبەکەیە.

پێڕەوی ناوخۆ کەبریتیە لەکۆمەڵێك بنەماو پرەنسیپ، پەیوەندییە ناوخۆییەکان و ئەرك و دەسەڵاتی ئەندام و ئۆرگانەکانی دیاری دەکات.

پێویست دەکات لەدانانی پێڕەوی ناوخۆی هەر حزبێکی سیاسی ڕەچاوی کۆمەڵە مەرجێك بکرێت :

١- پاراستنی یەکێتی حزبەکە :

٢- پیادەکردنی بنەماو هزرو ئایدیۆلۆژیای حزب.

٣- پابەند بوون بەدیسپلینی ڕێکخراوەیی.
٤- پەیوەندییە ناو خۆییەکان لەنێوان ئۆرگانەکان لەبنکەوە تا لوتکە، لەنێوان ئەندامان و ئۆرگان.
٥- شێوازەکانی بەڕێوەبەردنی کاروباری ناوخۆی حزب.
٦- بەهەند وەرگرتنی هەل و مەرجی کۆمەڵایەتی و کەلتوری کۆمەڵگە.

## ڕۆڵی پۆزەتیفانەی ئۆرگان بەسەر ئەندامان :

حزبی سیاسی بەهۆی ڕێکخستنەکانی، ئەندامانی لەناو ئۆرگان رادەهێنێ لەسەر پیادە کردنی بنەماکانی ڕێکخستن، شێوازەکانی پەیوەندیکردن و جۆرەها چالاکی و کاروباری حزبی وکۆمەڵایەتی و سیاسی ڕۆژانە، هەموو ئەوچالاکیانە کارتێکردنی پۆزەتیفانەی دەبێ لەسەر ڕەفتارو تواناکانی ئەندامان، دەکرێت لەچەند خاڵێك کورت بکرێنەوە:

١- ئامادە کردنی ئەندامان بۆ ئەوەی بۆ چوونە سیاسیەکانیان دەربارەی کێشەکان دروست بکەن.
٢- ئامادەکردنی کاندید بۆ هەڵبژاردن.
٣- ئامادەکردنی کادیر بۆ کاری سیاسی.
٤- دیاریکردن و خستنەرووی بەرژەوندییەکانی گروپەکانی ناوکۆمەڵگە.
٥- پێگەیاندنی سەرکردەو کادیرە سیاسیەکان.
٦- وەرگرتنی بیروڕای ئەندامان لەسەر بڕیارەکان.
٧- دەربارەی سیاسەت و بەرنامەو پلانەکان بەرچاو ڕوونی دەخاتە بەردەست ئەندامان.

## ڕۆڵی ئەندام لەناو ئۆرگان :

مەبەست لەم ڕۆڵە ئەو چالاکیانەی کە ئەندام پێی هەڵدەستێت وپێگەیەك دەنوێنێ لە پەیکەری ڕێکخراوەییدا، یان دیاریکردنی ئەو ڕەفتارە چاوەڕوانکراوەی کەئەندام پێی هەڵدەسێت بەپێی پێگەو پلەی لەو ناوەندەی کەکاری تیادا دەکات.

**بۆیە دەگرێت لەماوەی بەکار هێنانی پێگەو ڕۆڵ پێش بینی ڕەفتاری ئەندامان بکرێت لەئۆرگانەکان.**

ڕۆڵی ئەندام لەناو ئۆرگان بەپێی ئەرك یان ئەو دەسەلاتە فەرمیانەی پێی سپێراوە دیاری ناکرێت، سیستمە فەرمیەکان گرینگی دەدەن بەو ڕۆڵەی کەئەندامان پێی هەڵدەسن.

شان بەشانی هەموو ئەو بیروڕیانە، ڕۆڵی ئەندام کاریگەر دەبێت بەپێش بینی و بۆ چوونەکانی کەسانی دەوروبەری دەربارەی هەلس و کەوتەکانی، واتە لەلایەن هەڤالان و بەپرسانی دەوروبەری .

پیرەوی ناوخۆی حزبی سوسیال دیموکراتی ئەلمانیا ڕۆلی ئەندامی لەچەند خالێك باس کردووە:

١- هەموو ئەندامێك مافی ئەوەی هەیە لەچوار چێوەی پێرەوی ناوخۆی حزبدا لە دروستکردنی ئیرادەی سیاسی و لەهەلبژاردن دەنگداندا بەشداری بکات، هەروەها ئەرکی سەرشانیەتی کە پشتگیری لەئامانجەکانی پارتی سۆسیال دیموکرات بکات، لەکۆبوونەوەی ئەندامانی شوێنی ڕێکخستنەکەی مافی هەلبژاردن و دەنگدانی هەیە، کۆبوونەوەی ئەندامانی ڕێکخستنی شوێنگە پێویستە بەشێوەیەکی ڕێك و پێك و بەلای کەمەوە هەر شەش مانگ جارێك سازبکرێت.

٢- ئەو ئەندامانەی کەسالأنێکی زۆر لەریزی حزب ئەندامن رێزیان لێدەگیرێت، سەرۆکایەتی حزب دەتوانێت ماوەی ئەو کاتە دیاری بکات کە بۆ برپاری بەخشینی رێزگرتن لەئەندامان پێویستە.

٣- ئەو زانیاریانەی کە پەیوەندی بەئەندامەوە هەیەو بۆ کاروباری حزب پێویستن بەپێی یاسای پاراستنی داتەکان و رێساکانی حزب پارێزگارییان لێ دەکرێت، ئەو زانیاریانە تەنها دەخرێنە بەردەم هاوکارە سەرەکیەکانی حزب، سەرۆکایەتیەکان، لێپرسراوانی دارایی ئەگەر پێویست بوو بۆ رەفتارکردن لەگەڵ داتەکان، سکرتێری گشتی حزب رێنمایی پارێزگاری داتەکان دیاری دەکات.

پسپۆرە سیاسیەکان و سەرکردە جەماوەریەکان بایەخ بەرۆڵی ئاراستەکان دەدەن، زانینی چۆنیەتی گەشەکردنی ئەو ئاراستەو بۆ چوونانە، هەروەها تاچ رادەیەك دەکرێت جەختی لەسەر بکرێت و گۆرانی و بەسەردابێت، لەبەر ئەوەی ئەو هەڵوێستانە گوزارشت لەپەیوەندیکردن و کارلەیەککردنی نێوان کۆمەڵانی خەڵك دەکات، کە هەندێ جارمۆرکی هاوکاری هەڵدەگرێت و هەندێ جاریش ململانێ.

بۆیە پێویست بەتوێژینەوە دەکات لەو کارلەیەککردنە لەرووی ئاکارو خەسڵەتی گروپەکان، هەروەها ئاکارو هەڵوێستی ئەندامان، چونکە ئاراستەکان رۆڵی هێزێکی پالنەر دەبینێ کە ئەندامان بەرەو چالاکی و کارکردن دەبات بەشێوەیەکی دیار و رەنگە شێوازەکەش هاوکاری بێت یان رکاربەری بەکۆمەڵ بێت یان تاك.

زاراوەی ئاراستەکان پێناسەی جۆراو جۆری بۆ کراوە، بەکورتی مەبەست لەم زاراوەیە، حالەتێکە لەئامادەباشی ئەقلی و دەروونی لەلایەن تاکەوە کەلە رێگای ئەزموون و شارەزایی کۆبۆ تەوەو رێکخراوە. کار لەسەر ئەندام دەکات بۆ ئاراستەکردنی بەرەو هەڵوێست بابەت و شتەگرێدراوەکان بەو بارەوە.

لــەماوەی لێ وردبوونــەوەو توێژینــەوە لــەجۆری پەیوەندییــە ناوخۆییــەکانی زۆرینــەی حزبــەکان لەگــەڵ ئــەو لایەنانــەی پەیوەســتن بەپێکهاتــەی ئۆرگــانی و پەیوەندییەکانی نێوان ئەندام و ئۆرگانەکانی و مەرج بنەمای وەرگرتنــی ئەنــدام و دروســتکردنی ئۆرگــان، دووئاراســتەی جیاوازمــان بــۆ ئاشــکرا دەبێــت کەهــەر یەکەیان لەزۆر بواردا جیاوازن لەگەڵ یەکتر بە پێــی ئــەو ئایــدیۆلۆژیای بناغــەی هزری حزبەکە پێك دێنێت.

ئەو دوو ئاراستەیە بریتین لە:

١- ئاراستەی ناوەندێتی لەشێوازی پەیوەندیکردن و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان.

ئــەم ئاراســتەیە زۆربــەی حزبــە مارکسی و ناسیونالــستە توندڕەوەکان پیــادەی دەکەن.

٢- ئاراستەی ناناوەندێتی لەشێوازی پەیوەندیکردن و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان کەحزبە دیموکراسی و لیبرالەکانی پیادەی دەکەن.

دەکرێت ئاراستەیەکی تر زیاد بکرێــت کــە ئــەویش حزبــە سیاســیە ئیــسلامیەکان دەگرێتەوە کە تایبەتمەندی خۆیان هەیە لەم بوارەدا.

## ناوەندێتی :

مەبەســت لەناوەنــدێتی بــوونی دەســەڵاتی بریــاردان لەلایــەن یــەك کــەس یــان ئۆرگانێــك بەمــەش دەرفــەتێك دەدرێــت بەولایەنــەی کەدەســەڵاتی لەدەســت دایــە توانــای بــەکار هێنــانی مــاف و ســنورێکی بــەرفراوانی هــەبێ لــەبریاردان، بــەڵام لەئاستەکانی خوارووتر ئەم دەسەڵاتایان نابێ:

ئاکارەکانی ناوەندێتی :

١- ئۆرگانی باڵا توانای هەماهەنگی لەنێوان یەکە جیاوازەکان هەیە، ئەم کارە بــۆ یەکەکانی ئــەو ئۆرگانــە دەگەڕێتــەوە کــەخاوەن دەســەڵاتێکی گــەورەن بــۆ بــەکار

هێنانی ئەو دەسەڵاتەی کەهەیەتی لەهەڵسان بەکرداری خێرا بۆ بەیەك بەستنەوەی نێوان یەکەکانی ڕێکخستن.

٢- لەکاتێکدا ئۆرگانی باڵا کەدەسەڵاتەکانی بەدەستە، توانای بەکارهێنانی ئەو کارزانی و زانینانەی هەیە، بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکان بەشێوەیەکی وردو خێرا.

٣- ناوەندێتی دەبێتە هۆی دابین کردنی پلەیەکی بەرز لەچاو دێریکردنی ئاستەکانی خوارەوە، لەدوایدا زانینی هەر لادانێك یان دەرچوون لەئەرك بەجێگەیاندن.

٤- بریارەکانی ناوەندێتی زامنی کەمکردنەوەی هەوڵە ترسناکەکانە، ئەمەش بەبەراوردکردنی پێدانی دەرفەت بەئاستەکانی خواروو هەرکاتێك زانیارییەك یان زانینەك هەبێت.

٥- ناوەندێتی دەبێتە هۆی دەستەبەر کردنی جۆرێك لەیەکچوون و پابەندبوون بەسیستەم و ڕێنمایی و یاساو ڕێساکان، کەرەنگە لەلایەن ئاستەکانی خوارەوە پێشێل بکرێت.

## لایەنە نەگەتیڤەکانی ناوەدێتیٚ:

١- سەر قاڵ بوونی بەشەکانی ئۆرگانی باڵا بەکارە بچووکەکان بەهۆی گردبوونەوەی دەسەلات لەدەستیان.

٢- بەرپرس لەئۆرگانی باڵا کەدەسەڵاتی بەدەستە ناتوانێت گرنگی بەکارە ستراتیژییەکان بدات.

٣- بەرپرس لەئۆرگانی باڵا کەمتر سەرنج دەداتە ئەو ڕووداوانەی کە دەرفەتە دەبێ بیقۆزێتەوە یان هەڕەشەیە کەدەبێ خۆی لێی لابدات.

## نا ناوەندێتی :

مەبەست لە نا ناوەندێتی پێدانی دەسەڵاتی زۆرترو مافی بڕیاردان بۆ ئاستەکانی خوارەوەی ڕێکخستنە.

### ئاکارەکانی :

١- خێرایی زیاتر لەجووڵەو بڕیاردان.
٢- توانای زیاتر لەسەرگونجان لەگەڵ بارودۆخی دەوروبەرو گۆرانکارییەکانی.
٣- گرینگی دانی زیاترو گەرم و گوڕی لەلایەن ئاستەکانی خوارەوە بەهۆی بەشداری کردنیان .
٤- ئۆرگانی باڵاکاتی زیاتری هەیە تاوەکو گرینگی بدات بەکاری تایبەت و پلاندانانی ستراتیژی.

## یەکەم :

### ئاراستەی ناوەندێتی

أ) پەیوەندی نێوان ئەندام و ئۆرگان :

زۆربەی ئەو حزبە سیاسیانەی ئەم ئاراستەیەیان پێرەو کردووە، بنەمای (ناوەندێتی دیموکراسی) یان وەك بنەمایەکی بنچینەیی بۆ هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانیان دیاریکردوە، ئەم بنەمایە ئەم خاڵە سەرەکیانە دەگرێتە خۆی:

١- ملکەچی کەمایەتی بۆ زۆرینە، لەکاتی هەربڕیارێك. .
٢- ملکەچی ئۆرگانەکانی خوارەوە بۆ ئۆرگانەکانی سەرەوە.
٣- دیسپیلنی حزبایەتی هەموو لایەك دەگرێتەوە.

٤- یەك سەرکردایەتی لەلوتکەدا.
٥- ئەنجومەنی هەموو ئۆرگانەکان لەخوارەوە بۆ سەرەوە بەهەڵبژاردن پێکدێت.
٦- ئۆرگانەکانی خوارەوە راپۆرتی خولیان دەبێ بۆ ئۆرگانەکانی سەرەوە.
٧- مافی رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن بۆ ئەندامان لەماوەی کۆبوونەوەکاندا.
٨- بڕیاری ئۆرگانەکانی سەرووتر جێ بەجێ دەکرێت پاشان رەخنەوپێش نیازو پرسیاریان ئاراستە دەکرێت.

ب) شێوازی وەرگرتنی ئەندام، ئەرك و مافەکانیان، جۆری ئەندامان:
١- پێویست دەکات ئەندام بەپلەی پالێوراو تێپەڕ بێت کەماوەیەکی درێژدەخایەنێت.
٢- بۆ وەرگرتنی پلەی ئەندامیەتی پێویستە لەلایەن چەند ئەندامێکی کۆنتر پشتگیری بکرێت.
٣- ئەندام پێویستە لەکۆبونەوەکان ئامادە بێت و ئابوونەوە بدات و لەناو ئۆرگان رێك بخرێت.
٤- ئەندام هەر پێش نیازو داواکارییەکی هەبێ پێویست دەکات لەرێگای بەرپرسی ئۆرگانەکەی بەرزی بکاتەوە .
٥- پێویستە ئەندام پابەند بێت بە بنەماو بڕیارەکانی حزب و هەوڵی تێگەیشتنی ئایدیۆلۆژیاکەی بدات.

ج) پەیوەندییەکانی نێوان ئۆرگانەکان :

ئەم پەیوەندییانە دوو شێواز وەردەگرێ بەگشتی، کە بریتین لە :

١- پەیوەندیکردنی ئاسۆیی: لەنێوان دوو ئۆرگان یان زیاتر کە لەیەك ئاستی ڕێکخراوەیی بن، (وەك پەیوەندییەکانی نێوان دوو مەکتەب یان دوو مەڵبەند لەڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان)
ئەو پەیوەندییانە زیاتر بۆ ئاڵ و گۆڕ کردنی بیروڕا یان ڕاپەراندنی کاروباە ئاساییەکان دەبێ :
٢- پەیوەندیکردنی ستوونی : لەنێوان ئۆرگانەکانی سەرەوە لەخوار خۆیان یاخود بەپێچەوانە، وەك پەیوەندیکردنی مەکتەبی ڕاگەیاندن لەگەڵ لق و ناوەندی پارێزگاکان لەیەکێتی نیشتمانی کوردستان.
ئەم جۆرە پەیوەندییانە زیاتر مۆرکی فەرمی و جێ بەجێکردنی بڕیارەکان وەردەگرێت.

## دووەم :

## ئاراستەی ناناوەندێتی :

أ) پەیوەندییەکانی نێوان ئەندام و ئۆرگان (چەند بڕگەیەك لەپرنسیپەکانی ئەم جۆرە حزبانە :
١) بەئەندام وەردەگیرێت ئەوانەی دان بە بنەما ڕێکخراوەییەکانی حزبدا دەنێن. (لەهەندێ لەحزبەکان لەتەمەنی ١٤ ساڵیەوە بەئەندام وەردەگیرێت)
٢- کۆمیتەکانی سەرۆکایەتی بڕیاری وەرگرتنی ئەندام دەدەن، لەماوەی یەك مانگدا پێویستە بڕیاری وەرگرتنی ئەندام یەکلابکرێتەوە، پاش مانگەکە ئەگەر وەلامیش نەدرێتەوە، ئەو ئەندامە بەوەرگیراو دەژمێر درێت.
٣- کۆتایی هاتنی پەیوەندی ئەندام بەئۆرگانەوە بەهۆی مەرگ، وازهێنان دەرکردن دەبێ.

٤- هەموو ئەندامێك مافی ئەوەی هەیە لەچوار چێوەی پێرەوی ناوخۆی حزبدا لەدروستکردنی بڕیاری سیاسی و لەهەلبژاردن و دەنگدان بەشداری بکات.

٥- ئەو ئەندامانەی سالآنێکی زۆر لەڕیزی حزبدا ئەندامن، رێزیان لێدەگیرێت .

٦- کۆمیتەکانی حزب دەتوانن کۆبوونەوەکانیان بەکراوەیی سازبکەن.

ب) پەیوەندییەکانی نێوان ئۆرگان و ئۆرگان.

پەیکەری رێکخراوەیی لەو جۆرە حزبانەی کە بنەمای ناناوەندێتی پێرەو دەکەن دەکرێتە چەند بەشێك، هەروەك نموونەی.

هەر دوو حزبی کۆماری و دیموکرات لەولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو حزبی سوسیال دیموکرات لە ئەلمانیا.

بۆیە شێوازو میکانیزمی پەیوەندییەکان زۆر کراوەو سەربەستانە دەبێت و ئەندام و ئۆرگان رۆلّی گەورەو بەرچاویان دەبێ لەتێکڕایی کاروبارو سیاسەتەکانی حزب.

بۆ نموونە پەیکەری رێکخراوەیی حزبی سوسیال دیموکراتی ئەلمانیا بەم شێوەیە دارێژراوە. (٦٤)

أ) لەگەرەکەکان : ئۆرگانەکان بریتین لە :

شوینگە، بنەگەرەك، گەرەك

ب- لەسەر ئاستی ولآت :

١- کۆنگرەی حزب : کە ئەم دەزگایانەی لێ هەلّدە بژێردرێت:

أ) دەستەی سەرۆکایەتی .

ب) ئەنجوومەنی راوێژکاری.

ج) کومسیۆنی کونترۆلکردن.

ئاکارەکانی پەیوەندیکردن لەنێوان ئەم جۆرە ئۆرگانانە بەم شێوەی خوارەوە دەردەکەوێ:

١- ئاراستەی دورستبوونی ئیرادەی سیاسی لەژێرەوە بەرەو سەرەوە دەبێ.

٢- لەهەر گەڕەکێك حزب بۆی هەیە پیرەونامەیەکی تایبەتی بەخۆی دابێ .

٣- کۆمیتەکانی سەرۆکایەتی (ڕێکخستنی شوێنگە)کان بڕیاری وەرگرتنی ئەندام دەدەن.

٤- ئەو هەرێمانەی کە پتر لەگەڕەکێکی لێیە، گەرەکەکان (ئۆرگان) دەتوانن بەپێی پێویستی سیاسی خۆیان هاوبەندیتی هەرێمی لەنێوان خۆیاندا وەك یەکگرتنێکی ناوچەیی پێك بێنن.

٥- ئەو هەرێمانەی کە تەنیا یەك گەڕەکی لێیە، ئەوا بەپێی پێرەوی ناوخۆی گەرەك، دەکرێت هاو بەندیی ناوچەیی لەنێوان کۆمەلێك لەبنگەرەکەکان پێك بهێنرێت.

٦- ڕێکخستنی شوێنگەکان دەتوانن کەکەرتی ڕێکخستن بۆ خۆیان دروست بکەن، بەمەش ئەندامانی ڕێکخستن شوێنگەکان ئەرك و مافەکانیان بەپارێزراوی وەك خۆی دەمێنێتەوە .

٧- پالێوراوان بۆ نێنەرایەتی حزب و هەلبژاردنی راستەو خۆ بۆ پایەی پارێزگار لەلایەن ڕێکخستن شوێنگەکان دەس نیشان دەکرێت.

٨- ئۆرگانی حزب لەسەریەتی پابەند بێت بەبڕیاری ئەندامان، لەوپرسەی کە بڕیاری لەسەر دراوە.

٩- کۆمیسیۆنەکانی بڕیار لەلایەن بنگەرەك و گەرەك و سەرۆکایەتی حزب پێکدێت، ئەرکی سەرەکی ئەم کۆمیسیۆنە چاودێری چۆنیەتی پیادەکردنی پێرەوی ناوخۆیە لەکاتی کێشەکان.

پیادەکردنی هەر ڕێکخستنێك بۆ بنەمای ناوەندێتی یان ناناوەندێتی، چەند فاکتەرێك کاریگەری دەبێ لەدیاریکردنی، گرینگترین ئەو فاکتەرانە :

١- ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە لەگەڵ چالاکی و تواناو ئاراستەکانی.

٢- قەبارەی ڕێکخراوەکەو ڕادەی بڵاوبوونەوەی.

٣- ڕادەی باری سەقامگیری لەناو ڕێکخراوەکە یان گۆڕان و فراوان بوونی چالاکیەکانی.

٤- سروشتی ئەو کەش و هەوایە ڕێکخراوەییەی باوەو ڕادەی گۆڕان لە بەهاو هزرەکانی ناورێکخراو.

٥- هەل و مەرجی ناوچەیی و بیروباوەری ئەندامان، ڕادەی بەدەست هاتنی پێداویستە مادییەکان بۆ ژیانی ڕێکخراوەکە.

**سێیەم :**

**شێوازی پەیوەندیکردنی نێوان ئەندام و ئۆرگان لەناو کۆمەڵەکانی ئیسلامی سیاسی : ( ٦٥ )**

١- شێوازی بەکار هێنانی ئەندام لەرێکخراوە تایبەتیەکەی (الاخوان المسلمین) ڕەنگە هەلگری حەسلەت و ئاکاری ئالۆزییەکی توندو لێ ورد بوونەوەی زیادە ڕۆیی بێت.

ئەندام پلەی ئەندامیەتی تەواوی پێ نادرێت تاپاش ماوەیەکی دورو درێژ لە پێگەیاندن کەچەندین ئەزموونی ورد دەگرێتە خۆی.

٢- پرۆسەی پێگەیاندنی ئەندام چەندین لایەنی گیانی و کۆمەڵایەتی و دەروونی دەگرێتە خۆی دەربارەی کەسی پالێوراو بۆ ئەندامیەتی، بەجۆرێك کە ئەندام تێکەڵاوییەکی تەواوی هەبێت لەگەڵ ئەم کۆمەڵە، هەروەها لەم

قۆناغـەدا پێویـست دەکـات ئەنـدام چـەندین کارامـەیی لـەبواری ژیـری و سەربازی و کۆکردنەوەی زانیاری و ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکان پەیدا کردبێ.

ئـەم قۆناغـە ماوەکـەی نزیکـەی (٦٠) هەفتـە درێـژە دەکیـشێت پـێش ئـەوەی بـە قۆنـاغی تاقیکردنـەوە تێپـەڕ بێـت کەماوەکـەی (٨) هەفتـە دەخایـەنێت، واتـە بەگشتی (٦٨) هەفتە دەبێت.

لـەم مـاوە دوورو درێـژەدا کەسـی پـالێوراو لـەژێر چـاودێری و چـەندین تاقیکردنەوەی ورد دەبێت لەرووی (تیوری پراکتێکی)یەوە.

٣- پالێوراو پێویست دەکات نهێنی پارێز بێت و لای کەس هیچ نهێنیەك ئاشکرا نەکات بۆ هەر مەبەستێك بێت، ئەگەر نهێنی ئاشکرا بکات ئـەوا ڕەنگـە ئـەو کەسـە بـەرەو ڕووی سـزای کوشـتن ببێتـەوە، هـەورەها لەرێکخـستنی کۆمـەڵ دوور دەخرێتەوە لەهەر پلەو پایەیکدا بێت، یاخود بەهەر هۆیەکەوە بێت.

سـەرەرای ئەوانـە پێویـستە پـالێوراو متمانـەو بـاوەڕی تـەواوی بەسـەر کرادایەتیەکـەی هـەبێ، ناکرێـت بـۆ هـیچ کێـشەیەك ڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدی بەسەرکردایەتی باڵابکات تەنها لە ڕێگای بەرپرسـەکەی نـەبێ، ئـەم کارە تووشـی لێپرسینەوەی دەکات.

## بەکورتی :

**حزبە سیاسیەکان بەشێوەیەك ڕێکدەخرێن کـە هـیچ جیاوزییـەکی نـەبێ لەگـەڵ شێوازی ڕێکخستنی ڕێکخراوە سەر کەتووەکانی ترو بە ڕێوەبردنیـان، مەبەسـتیش لـەوە لەسـەر ئاسـتی بنـەڕەتی ئەوەیـە کـە دەبـێ حزبـی سـەرکەوتوو خـاوەن ڕێکخستنێکی باش و ئیدارەو پەیوەندییەکی ئەو تۆ بێت کـە لەلایـەن ئەنـدامانی ئەو حزبەوە ناسراوو ئاشکرا بێت.**

پابەندبوونی حزبی سیاسی بەبەهاوبنە مارێکخراوەییەکان لەناو ئۆرگانەکانی ڕێکخستن، پێکهاتەی ناوخۆی حزب نیشان دەدات ستراکتوری ناوخۆی هەر حزبێك ناکرێت بەشێوەیەکی خۆکردنی پێك بێت بەڵکو پێویستی بەدیدێکی روون و هەڵسەنگاندنێکی ستراتیژیانە هەیە.

پێویستە بەرپرسانی حزب لەسەر ئاستی پێگە ناخۆییەکان هەروەها ئەندامانی لەبارێکی ئەو تۆدابن کە بتوانن هەرچی گونجاو لەبارە لەبەرنامەکاندا ئامادەی بکەن، وەك ڕێکخستنی کۆڕو کۆبوونەوە گشتیەکان و ئەنجامدانی هەڵمەتی راکێشانی ئەندامانی نوێ بۆ ناو حزب و دەرفەتی ئازادی و رادەربرین .

لێهاتووی و ئازایەتی سەرکردەی حزبەکان بەتەنها بەس نیە بۆ کاری ڕێکخراویی و سیاسی ئەگەر جەماوەریان بۆ ئاراستە نەکرێت و ڕێکسختنی توندو تۆڵ و شارەزایان نەبێت و ئەندامانیان بۆ هان نەردێت بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەرکەکان.

بەڵام دەبێ ئەو چالاکیە ناو خۆییانە لەگەڵ سیاسەتە بنچینەییەکانی حزبدا بگونجێت، بوونی هاوسەنگی لەنێوان ئەرك و تواناکان، لەنێوان ماف و دەسەڵاتەکان لەناو ئۆرگانەکاندا (لەهەموو ئاستە جیاوازەکان) دەبێتە هۆیەك بۆ سەقامگیری و پەرەپێدانی ڕێکخراوەکە، بەپێچەوانە تووشی ململانێ و سەر لێشێواندن و دوور کەوتنەوە دەبێ لەپابەند بوون بەبنەماکانی ڕێکخستن.

سەرکردەو کادیرو ئەندامانی حزب بەرپرسیارن لەسەر ئاستی ناوخۆیی لەبەشداریکردنیان بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی و بنەماکانی حزب لەسەر ئاستی نەتەوەیی.

# باسی سێیەم

## پەیکەری رێکخراوەیی و جۆری سەرکردایەتی

لەهەموو حزبێکی سیاسی پەیکەری رێکخراوەیی پێکدێت لەکۆی ئۆرگانەکان (واتا هەموو یەکە رێکخراوەییەکان) لەخوارەوەکە بنکەی فراوانی حزب لەناو جەماوەر پێکدێنێت تالوتکەی سەرەوە کە بەرزترین دەسەڵاتە.

پێوەری ناوخۆی هەر حزب و رێکخراوێکی سیاسی ئاماژەی بۆ ئەو شێوازو بنەماو دیسپلینە تایبەتیانە کردووە کە میکانیزمی کارکردنیان دیاری دەکات، ئەم پەیکەرە بڕبڕەی پشتی هەر حزبێکی سیاسی پێکدێنێت و هۆکاری مانەوەو درێژە پێدانی تێکۆشانیەتی .

ئۆرگانەکان لەناو حزبە سیاسیەکان بۆ ئەوەی کاراو چالاك بن پێویستە ئەم ئاکارانەیان تیادا بەدی بێت:

١- تێگەیشتنی باشیان هەبێ بۆ سیاسەت و ئایدیۆلۆژیای حزبەکە.

٢- پابەندبوونی هۆشیارانە بۆ بەرنامەو بنەماکانی رێکخستن.

٣- بوونی بەرنامەیەکی سیاسی و رێکخراوەیی گونجاو لەگەڵ هەل و مەرجی کۆمەڵگە.

٤- رۆڵی کاریگەری سەرکردایەتی و کادیرانی بەرچاو بێت.

ئۆرگانەکان زیاتر ئامرازو کەرەستەی ئاراستەکردن و ژێر دەستەیی حزبەکەن بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ دەبنە هۆی ئەوەی کە دەستەیەك لەسەرکردەو سیاسەتمەدارانی حزب ببنە خاوەن دەسەڵات و بڕیار.

حزب بۆ ئەوەی چالاکیەکانی و ڕۆڵی خۆی باشتر ڕاپەڕێنێت لەهەموو پلەو دۆخێکدا ئەوا هەوڵی ئەوە دەدا کە پەیکەری ڕێکخراوەیی خۆی (بەهەموو شێوازەکان) توندو تۆڵ و بەهێز بێت و کارەکانیان بەرێك و پێکی ئەنجام بدەن.

لەو نووسینانەی دەربارەی ڕێکخستن و ڕێکخراوەکان دەنووسرێن، زاراوەی (٦٦) (زنجیرەی پەیکەر یان پەیژەی پەیکەری ڕێکخراوەیی) باوەو دێتە روو، کەبەسیمایەکی گشتی بۆ هەموو ڕێکخراو حزبە سیاسیەکان دادەنرێ.

ئەم زاراوەیە دەکرێ پێناسەبکرێ بەوەی سستمێکە ڕۆڵی فەرمی بەسەر ئەندام و کادیرانی ناو ئۆرگانەکان دابەش دەکات، یان دەکرێ بووترێ کەسیستمی پلەو پایەکانە، مەبەست لەو پلەو پایانە ئەو کۆمەڵە ئەرك و مافانەیە کە پێویستە کادیر خۆی بۆ تەرخان بکات.

ئەم سیستمە بەهەموو شێوازەکانی هەندێ خاڵی لاوازی تیادا بەدی دەکرێ، وەك : پەککەوتوویی لە کەم کردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە هەیە لە نێوان ڕۆڵە فەرمیەکەی کە خۆی دەنوێنێ لە بەرپرساریەتی و دەسەڵات و نێوان ڕۆڵە کردەییە ڕاستیەکە کە بەستراوەتەوە بەهێزو توانای ئەرك بەجێ گەیاندن، بۆ نموونە زۆرێك لەوانەی پسپۆرو لێهاتوون و توانای ئەرك بەجێگەیاندنی گرینگ و بالایان هەیە بەلام خۆیان لەخوارووی یان ناوەڕاستی ئەو پەیژە ڕێکخراوەییە دەبیننەوە، لەهەمان کاتدا چەندین ئەندام و کادیری بێ توانا هەیە کەلە ئاستە بالاکانی ئەو پەیکەرەن.

قسەکردن دەربارەی زنجیرەی پەیکەری ڕێکخراوەیی رامان دەکێشێتە سەر باسکردنی ئاستەکانی، چەندین پرسیار لەم بوارەدا دێتە روو، گرینگترینیان

ئەوەیەکە لەکاتی دارشتنی پەیکەرەکە دەخرێتە ڕوو، ئاستە ڕێکخراوەییەکان کە ئەو پەیکەرە دەیگرێتە خۆی ژمارەیان چەندە؟

هەروەك باوە هەرئاستێك کۆمەڵە ئۆرگانێك (یەکە)ی جۆراو جۆر و لەیەك چوو دەگرێتە خۆی.

توێژینەوەی زۆر کراوە لەم بارەوە، دەربارەی کاریگەری پەیکەری ڕێکخراوەیی بەپێی ژمارەی ئاستەکانی، ئەنجامەکان دەریان خستووەو جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە ئەو ڕێکخراوانەی کەمترین ئاستی ڕێکخراوەییان هەیە کاریگەرتر دەبن.

## نموونەی پەیکەری ڕێکخراوەیی چەند حزبێکی سیاسی:

### یەکەم //

### پارتی دیموکراتی کوردستان : (٦٦)

پەیکەری ڕێکخراوەیی لەبنکەوە بەرەو لوتکە :

- شانە : پێکدێت لەچەند ئەندامێك لەنێوان (٣ — ٧) ئەرکیان پەیوەندی ڕاستەوخۆیە بەجەماوەرەوە.
- شانەی سەرەکی: پێکدێت لە چەند شانەیەك کەبەرپرسەکانیان لەیەك شانە کۆدەبنەوە.
- ڕێکخراو : بریتیە لەچەند شانەیەکی سەرەکی لەسنوری گەڕەکێك یان دامەزراوەیەك یاخود چەند گوندێك.

- لیژنەی ناوچەی : چەند ڕێکخراوێك دەگرێتە خۆی لەسنوری ناوچەیەکی جوگرافی یاخود لەڕووی پیشەییەوە ئەندامانی سەربە چەند پیشەیەك دەبن.
- لق : سنوری چالاکی چەند لیژنە ناوچەیەك دەگرێتە خۆی.
- مەکتەبی ناوەندی ڕێکخستن : دەزگای سەرەکی حزبەکەیە بۆ ڕێکخستن.
- مەکتەبی سیاسی : دەستەی کارگێری کۆمیتەی ناوەندییە .
- کۆمیتەی ناوەندی : لە (٣١) ئەندام و (٩) ئەندامی یەدەگ پێکدێت، لەلایەن کۆنگرەوە راستەو خۆ هەڵدەبژێردرێن.
- سەرۆك : سەرۆکی حزب و کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەری سیاسیە لەلایەن کۆنگرەوە راستەوخۆی هەڵدەبژێردرێت.
- کۆنگرە : بەرزترین دەسەڵاتە لەحزبدا، بەپێی پیرەوی ناوخۆ (٤) ساڵ جارێك کۆنگرە دەبەسترێ.

## دووەم //

## یەکێتی نیشتمانی کوردستان : (٦٨)

پەیکەری ڕێکخراوەیی لەبنکەوە بەرەو لوتکە :

- شانە : یەکەم بازنەی ڕێکخستن و ئۆرگانی ناوکۆمەڵانی خەلکە ژمارەی ئەندامانی (٣ — ١١) ئەندام دەبێ.
- پۆل : سەرپەرشتی شانەکانی سنوری چالاکی خۆی دەکات ژمارەی ئەندامانی لەنێوان (٥٠ — ٧٥) ئەندام دەبێ.
- کەرتی ڕێکخستن : سەرپەرشتی پۆلەکانی سنوری چالاکی خۆی دەکات، لاینی کەم لە (٣) پۆل پێکدێت.

- کۆمیتەی ڕێکخستن : لەسەرجەم کەرتەکانی ڕێکخستن پێکدێت لەسەر بنچینەی جوگرافی بەلەبەر چاوگرتنی حاڵەتی پیشەیی، لانی کەم لە (٥) کەرت پێکدێت.
- مەڵبەندی ڕێکخستن : لەسەر بنچینەی جوگرافی دیاریکراوو چڕی دانیشتوان و هەل و مەرجی سیاسی ناوچەیی دادەمەزرێت.
- مەکتەری ڕێکخستن : ئۆرگانێکی سەرکردایەتە بۆ نوێنەرایەتیکردنی هەموو ڕێکخستنەکان.
- کۆمیتەی سەرکردایەتی : ڕاستەو خۆ لەلایەن کۆنگرەوە ئەندامانی هەڵدەبژێردرێت لە (٣٥) ئەندام و (١٠) ئەندامی یەدەگ پێکدێت.
- مەکتەبی سیاسی: لەلایەن کۆمیتەی سەرکردایەتیەوە هەڵدەبژێر درێت، ژمارەی ئەندامانی بەسکرتێری گشتیەوە لەنێوان (٩ — ١١) ئەندام دەبێ.
- کۆبوونەوەی فراوان (پلینۆم) : لەکاتی هاتنەپێشی ڕووداوێکی گرینگ، یان لەسەر داوای (دوو لەسەر سێی) ئەندامانی سەرکردایەتی یان سکرتێری گشتی دەبەسترێ.
- کۆنگرە : بەرزترین دەسەڵاتە بەپێی پێرەوی ناخۆ هەر دوو ساڵ جارێك دەبسترێ.
- لەتێروانین بۆ بەشی زۆری پەیکەری حزبە سیاسیەکانی کوردستان ئەوەی بەدی دەکرێت کەخاڵی هاوبەشان زۆرە وەك:

١- هەموو حزبە سیاسیەکانی کوردستان پەیکەری ڕێکخراوەییان شێوەیەکی قوچەکی وەرگرتووە، بنکەیەکی فراوانی ناوجەماوەر تابەرەو سەرەوە هەڵکشێین ژمارەی ئۆرگانەکان زۆر کە متر دەبنەوە .

٢- شێوازەکانی پۆلینکردن و دابەشکردنی ئەندامان بەگشتی لەسەر بنەمای جوگرافی یان پیشەیی دەبێ.

٣- دەسەڵاتەکان تابەرەو سەرەوە هەڵکشێین بەهێزو زۆرتر دەبێ.

٤- لەناو بەشی زۆری حزبە گەورەکان دەستەی بژاردەی دەسەڵاتدار دروست بووە.

٥- پەیوەندیکردنی نێوان ئۆرگانەکانی خوارەوە بۆ سەرکردایەتی ئاڵۆزبوون و دژواری تیادا بەدی دەکرێ.

## سێیەم //

## حزبی کۆمونیستی عێراقی : (٦٩)

پەیکەری ڕێکخراوەیی حزبی کۆمونیستی عێراقی لەبنکەوە بەرەو لوتکە :

- شانە : ئۆرگانی بنکەیی حزبە لەناوجەماوەر، ژمارەی ئەندامانی دیاری نەکراوە.
- ڕێکخراو : کۆی شانە حزبیەکانە، بەپێی ناوچەی جوگرافی یان شوێنی کارکردن.
- لیژنەی پارێزگا: هەموو ئەو ڕێکخراوانە دەگرێتە خۆی کە لەسنوری پارێزگایەکدا ئۆرگانێکی سەرکردایەتی ناوچەییە.
- کونفراس (ئەنجومەنی گشتی حزب) : لەسەر داواکاری کۆمیتەی ناوەندی دەبەسترێ لەماوەی (١,٥) یەك ساڵ و نیودا جارێك، لەکاتی هەر ڕووداوێکی دەرەکی یان ناو خۆیی گرینگ.
- کۆمیتەی ناوەندی : ئەنجومەنی سەرکردایەی و جێ بەجێکردنە لەنێوان دووکۆنگرە لەلایەن کۆنگرەو ئەندامانی دیاری دەکرێن.
- مەکتەبی سیاسی: نووسینگەی کۆمیتەی ناوەندیە، بڕیارەکانی جێ بەجێ دەکات.

- سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی: نوێنەرایەتی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی دەکات بەرپرسی یەکەمە لەجێ بەجێکردنی بڕیارەکان.
- لێژنەی چاودێری ناوەندی: چاودێری جێ بەجێ کردنی بریارو بەرنامەی ناوخۆی حزب دەکات.
- کۆنگرەی گشتی حزب : بەرزترین دەسەڵاتە، هەرسێ ساڵ جارێك دەبەسترێ، لەسەرداوای کۆمیتەی ناوەندی.

## چوارەم //

## پارتی سوسیا دیموکراتی سوید : (٧٠)

پەیکەری ڕێکخراوەیی پارتی سوسیال دیموکراتی سوید لەبنکەوە تا سەرەوە :

- کەرتی ڕێکخستن : بنکەی ڕێکخستنی جەماوەری ئەم پارتەیە.
- کۆمیتەی ڕێکخستن : سەرپەرشتی کەرتەکانی ڕێکخستن دەکات لەسنوری شارەوانیەك.
- مەڵبەند : مەڵبەند لەسەر ئاستی هەرێمێك دەکرێتەوە، سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی چەند شارەوانیەك دەکات.
- کۆمیتەی سەرکردایەتی : لە (٣٣) ئەندام پێکدێت، چوار ساڵ جارێك لەلایەن کۆنگرەوە هەڵدەبژێردرێت.
- ئەنجومەنی ڕاوێژکاران : پێکدێت لە (١٢٠) ئەندام لەلایەن کرنگرەوە هەڵدەبژێردرێت.
- لیژنەی بەڕێوەبردن (مەکتەبی سیاسی) لە (٧) ئەندام و (٧) ئەندامی یەدەگ پێکدێت.
- مەکتەبی ناوەندییەکانی پارتی سوسیال دیموکراتی سوید :

- مەکتبەی رێکخستن : مەکتەبی کاروباری پەیوەندیکردن، مەکتەبی دارایی و کارگێری، مەکتەبی پەیوەندییەکانی,
- سکرتێری حزب: لەنێوان ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دیاری دەکرێت.
- سەرۆکی حزب : لەکۆی ئەو (٧) کەسەی کەمەکتەبی سیاسی پێکدێنن، بەرپرسە لەتەواوی کارەکانی حزب و حکومەت و پەرلەمان.
- کۆنگرە : بەرزترین دەسەڵاتە، هەر (٤) ساڵ جارێك دەبەسترێ

(٧١) هێلکارییەك بۆ پەیکەری حزبی سوسیال دیموکراتی سوید

## پێنجەم //
## پەیکەری ڕێکخراوەیی حزبە سیاسیەکان لە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا (٧٢)

بەگشتی پێکهاتەی ڕێکخراوەیی حزبە سیاسیەکان لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دابەش دەکرێتە سەر (٣) بەش کە بریتین لە :

پەیکەری ڕێکستنی ناوچەیی.

پەیکەری ڕێکستنی ویلایەتەکان

پەیکەری ڕێکستنی فیدرالی

جۆری ڕێکخستنەکانیش لەویلایەتێکەوە بۆ ویلایەتێکی تر دەگۆڕێت.

**أ ) پەیکەری ڕێکستنی ناوچەیی :**

١- بازنە Precinct

**بەویەکە بنەڕەتیە دەوترێت بازنە، کە حزبە سیاسیەکانی لێ پێکدێت، لە ناوچەیەکی دیاریکراوی جوگرافی هەیەو لەشارە گەورەکانداو بەلای کەم لە ( ٢٠٠ – ١٠٠٠ ) دەنگدەر پێکهاتووە، بەلام لە گوندەکان لەبەرفراوانی ناوچەکان و دووری گوندەکان لەیەکتر لە ( ٥٠ – ١٠٠ ) دەنگدەر لەخۆ دەگرێت.**

٢- ئەندام لیژنەی بازنە :

**بەو کەسە دەوترێت کە سرۆکایەتی بازنەیەکی حزبی دەکات و کار دەکات بۆ کۆکردنەوەی دەنگ بۆ حزبەکەی.**

٣- ناوچە : Ward

هەر ناوچەیەك لە ( ٦ — ٢٠ ) بازنەی هەلبژاردن پێکدێت و لەناو ئەندام لیژنەی بازنەکاندا کەسێك هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی ببێتە بەرپرسی ناوچەکە.

٤- شار : City

ڕێکخستنی شار لەچەندین ناوچە پێکهاتووە کەسەرۆکی شارولیژنەی ناوەندی بەڕێوەدەبەن، ئەندامانی لیژنەی ناوەندی لە ( ١٠ - ٦٠ ) کەس پێکهاتووە، هەر ناوچەیەك نوێنەرێك یان دوو نوێنەری تیادا هەیە کەبەهەلبژاردن هەموویان سەرۆکی شار هەڵدەبژێرن.

٥- کەرت — قەزا County

لەناو گوند نشینەکاندا دوای بازنەی کەرت دێت، ئەگەر چی هەندێ جار ناوچە دێت بەلام بەگشتی کەرتەکان ( قەزاکان ) دێن کە لە ( ٥ — ١٠٠ ) کەس پێکهاتووە، سەرۆکی بازنەکان ئەندامن لەلیژنەی کەرتەکان.

٦- هەرێم The District

دووابەشی هەرەمی حزبیە لەخوار ویلایەت، سنوری جوگرافیای بریتیە، لەسنوری بازنەی هەلبژاردنەکانی کۆنگریس و هەرکەرتێك دوو نوێنەری لەلیژنەی سەرۆکایەتی هەرێمدا هەیە.

**ب ) ڕێکخستنی ویلایەتەکان :**

١- لیژنەی ویلایەتەکان :

**بۆ هەرکەتێك یان ناوچەیەك هەیە نوێنەرێك یان دوو نوێنەری هەبێت کە یەك دەنگیان دەبیّ لەلیژنە ناوەندییەکانی ویلایەتەکاندا، ئەمانە خەڵکانی دیارو بەرچاو دەبن و لەلایەن خەڵکەوە ناسراون لەلیژنە ناوەندییەکانی ویلایەتەکان و ڕێکخراوێکی تەواو پێکدەهێنن، لەسەرۆکی ویلایەت و جێگرەکەی و سکرتێری و خەزنەدار لەگەڵ لیژنەی تەنفیزیدا کە ساڵانە چەند کۆبوونەوەیەك ئەنجامدەدەن و لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا چالاك دەبن.**

٢- بنکەی سەرەکی حزب لەویلایەتەکاندا :

**هەردوو حزبی گەورە بنکەی سەرەکیان هەیە کە دەکەونە پایتەختی ویلایەتەکان یان گەورەترین شاری ویلایەتەکە، هەڵدەستن بەکاری حزب لەماوەی هەڵمەتەکانی هەلبژاردنیشدا زۆر چالاك و بەرچاو دەبن و ژمارەیان زۆر زیاد دەکات بۆ پێشوازیکردن لەخەڵك.**

٣- کۆنگرەی ویلایەت :

**حزبە سەرەکیەکان لەزۆربەی ویلایەتەکاندا دوو ساڵ جارێك کۆنگرەی ویلایەت دەبەستن و ئەندامانی کۆنگرە لەو ئەندامانەی حزب پێکهاتوون کە لەکۆنگرە ئامادەکارییەکاندا سەرکەوتون و جاری وا هەیە نزیکی هەزار کەس لەکۆنگرەی ویلایەتێکدا بە شداری دەکات کە ئەوانیش لە فەرمانبەرانی حزب و پالێوراوان و سەرۆکی ئۆرگانەکانی حزب و ڕۆژنامە نووسان پێکدیّ و ( ٢ – ٣ ) ڕۆژ دەخایەنیّ و دەسەلاتی هەڵبژاردنی نوێنەر بۆ کۆنگرەی فیدرالی و ئامادە کردنی لستی پالێوراوانی بۆ پۆستە حکومیەکان هەیە.**

**ج ) ڕێکخستنی ئەهلی :**

١- لیژنەی ئەهلی :

**هەریەکە لەدو حزبە گەورەکە چەندین لیژنەی ئەهلیان هەیە کە ژمارەی ئەندامانی هەر لیژنەیەك ( ١٠٠ )کەس دەبێ و هەر لیژنەیەك لەلایەن ( ٢ ) کەسەوە بەڕێوەدەچێت ( ژنێك – پیاوێك ).**

**سەبارەت بەحزبی کۆماریخواز سەرۆکی حزب لەو یلایەتەکاندا ئەندامە لەلیژنەی ئەهلیدا هەروەك ئەندامانی لیژنەی ئەهلی هەلدەبژێردرێن لەکۆنگرە فیدرالیەکانی حزبدا کە هەر چوار ساڵ جارێك دەبەسترێن، هەر ویلایەتێك لستی پالیۆراوەکانی دەدا بەلیژنەی فیدرالی بۆ هەلبژاردنیان لەکۆنگرەی فیدرالیداو سالانەش کۆبوونەوەی خۆیان دەبەستن.**

٢- ناوەندی سەرۆکایەتی ئەهلی :

**هەریەکە لەدوو حزبە گەورەکە بارەگای تایبەتی خۆیان لەواشنتۆن هەیە و لە کاتی هەلبژاردنی سەرۆکایەتیدا بەسەدان کەس کاری تێدا دەکەن و چەندین لقیشی لێ دەبێتەوە.**

**بەلام لەکاتە ئاساییەکاندا وەك بارەگایەکی سادە دەبینرێت، کاری ئەم ناوەندەش سەرۆکایەتیکردن و بەڕێوەبەردنی سەرجەم ڕێکخستنەکانی حزبە لەسەرانسەری ولاتدا لەسەر ئاستی نیشتمانی بۆ هەلبژاردنی سەرۆك، بەلام هەرکە هەلبژاردنی سرۆك کۆتایی هات ئەمیش تەنها چەند فەرمانبەرێکی تیادا کار دەکات.**

## شەشەم //

## خەسلەتەکانی پەیکەری ڕێکخراوەیی گروپە ئیسلامیە سیاسیەکان لەمیسر : (٧٣)

گرینگترین خەسلەتەکانی پەیکەری ڕێکخراوەیی ئەم گروپانە بریتین لە :

١- خەسلەتەکانی پەیکەری ڕێکخراوەیی ئەم گروپانە جیاوازیان تێدا بەدی دەکرێت لەنێوان ئالۆزی توند و ساکاریدا، لەکاتێکدا کۆمەڵەی – الاخوان المسلمین – سستمێکی پەیکەری ئالۆزو توندی پێڕەو کردووە چ لەباری کاری گشتی بە ئاشکرا بێت یان لەسیستمی تایبەتی نهێنی، دەبینین ڕێکخراوی – التفكير والهجرية – پەیکەرێکی ڕێکخراوەیی ساکاری هەیە، ئەمیری ڕێکخراوەکە لە لوتکە دایە پاشان ئەمیری گروپەکانی دێت و دواتر ئەندامانی گروپەکان، هەمان شێوە بۆ گروپی هونەری سەربازی، لەناو هەردوو گروپ کەناڵەکانی پەیوەندیکردنی ڕاستەو خۆ لەنێوان ئەندامان و ئەمیری گروپ زۆرە.

بەڵام ئەم دیاردەیە بەدی ناکرێت لەبازنەی سیستمی تایبەت بۆ کۆمەڵی ( الاخوان المسلمین) کەرێگا لەم جۆرە پەیوەندیکردنە دەگرێت تەنها لەڕێگای ئەمیری گروپە بچووکەکەوە دەبێ.

بەڵام ڕێکخستنی (الجهاد) نموونەیەکی مام ناوەندیانەی خستۆتە ڕوو، لەنێوان ئالۆزی و ساکاریدا، ئەم ڕێکخستنە پێکدێت لە (ئەمیر) کەسەرۆکایەت ئەنجوومەنی شورا دەکات و لە (١١) ئەندام پێکدێت هەروەها سێ لیژنەی لاوەکی دێن هەر یەکەیان ئەمیرێك سەرکردەیانە، لیژنەکانیش (لیژنەی ئابوری – لیژنەی بانگەواز – لیژنەی ئامادەکاری)، سەرەڕای ڕێکخستنی (٦) بەشی تر لەسەر ئاستی پارێزگاکان لەڕاستیدا ئەو جیاوازیانە لەنێوان ئالۆزی و سادەییدا لەپەیکەری ڕێکخراوەیی بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرینگترینیان، دۆخی

پێکهاتنی کۆمەڵەکە، ئەو یەکەمایەتی بۆ چالاکیەکان دیاریکردووە، ئەو ماوەی لەبەر دەستی دایە پێش بەرەنگار بوونەوەیان لەگەڵ دەزگاکانی ئاسایش، هەروەها شارەزاییە ڕێکخراوەییەکانیان.

٢- سەرەرای ئەو جیاوازیانە لە ئالۆزی و سادەیی پەیکەری ڕێکخراوەییان، بەلام هەموویان بە خسلەتی زاڵبوونی دەسەلاتی تاکرەوانە ناسراون لەسەر هەموو ئاستەکانی ڕێکخستن، زۆر بەروونی ئەو دیاردەیە دەبینرێت لەزۆربەی ئەو کۆمەلانە، بگرە لە (حسن البنا) وە یەکەم رابەری گشتی (اخوان المسلمین) تا (صالح سرية) و (شكر مصطفى) و عبدالسلام فرج) وە پێوەری پێشکەوتن لەپلەو پایەکانی دەسەلات لەناو ئەو کۆمەلانە پەیوەستە بەپێوەری ملکەچی ئەندام بۆ سەرکردەی تاك رەو، بۆیە خسلەتی بنچینەیی لەپەیوەندی نێوان ئەندام و سەرکردەی تاکرەو خسلەتی ملکەچیەکی رەهایە.

هەرچەندە کۆمەڵی (الاخوان المسلمين) بەشێوەیەکی ڕێژەیی نموونەیەکی زیاتر پێشکەوتووی پێشکەش کرد بەلام رابەری گشتیان پابەند نەدەبوو بە بڕیاری شورا، ئەو جۆرە پەیوندییانە تەنها ئاستی سەرکردایەتی نەگرتبۆوە بەلکو درێژەی کێشابوو بۆ ئاستەکانی خوارەوەش، بۆیە پێویست دەکات ئەندام لەئۆرگانەکانی خوارەوەش ملکەچ بێت ملکەچیەکی تەواو بۆ ئەمیری گروپەکەی، ئەو ئەمیرەش ملکەچی ئەمیری ئاستی بەرزتربێ، بەم جۆرە تادەگەینە لوتکەی پەیکەری دەسەلات.

تەوەری بنچینەیی ملکەچی لەئاستەکانی خوارەوەدا ملکەچیە بۆ سەرکردایەتی بالای تاك رەو لەکۆتاییدا.

ئەم دیاردەیە خەسلەتی بنچینەیی پەیوەندییەکانی بەدەسەلاتەوە (وە دەسەلاتێکی ئۆتۆکراسی) دەخاتە روو لەپاکترنی وێنەکانی.

٣- پەیکەری ڕێکخراوەیی ئەم کۆمەڵانە بە فەرمیـەتی و خۆگونجانـدن ناسـراون لەگەڵ بارو دۆخەکەدا ، باشـترین نموونـەی ئـەم جـۆرە ڕێکخراوانـە کۆمـەڵی (الاخـوان المـسلمين) لـەزانکۆدا، کـەزۆر سـادەو لەسـەر ئاسـتێکی بـەرزی لێهاتوویدایە.

سـەرۆکی بەشـی زانکـۆ بەرپرسـیاری ڕاسـتەو خـۆی سـەرۆکی کۆلیژەکانـە، هـەر کۆلیـژێك دابـەش دەبێتـە سـەر چـەند بەشـێك، تایبـەت بـەکاروباری یـەك سـاڵ خوێندن، سەرۆکی بەشـەکانی کۆلیـژ بەرپـرسن لـەرەفتاری ئەنـدامیان لەبـەردەم ئەمیری کۆلیژ، ئەم جۆرە دابـەش بوونـە ڕێگا بەرێکخستنی (الاخـوان المـسلمين) دەدا لـەناو زانکـۆدا لەیەکـەی بـچوکدابن و بـەخێرایی کـۆ ببنـەوە، هـەروەها لەگەورەییدا بەو ڕادەیەی کە ڕێگای کارتێکردنی کارای پێدەدا لەناو کۆلیژەکان. بـەڵام پەیوەنـدیکردن لـەنێوان کۆلیـژەکان لـەڕێگای ئـەمیری زانکـۆوە ئـەنجام دەدرێت.

٤- زۆربـەی ئـەم کۆمەڵانـە شێوازی ڕێکخـستنی هێـشوویان پێـرەو کـردووە، کـە لەسەر بنچینەی کۆمەڵەی بچوك بچوك پێکهاتوون، هەندێکیان هەندێکی تر نەناسن بۆ پاراستنی نهێنی زۆرتـرین ژمـارە لەئەنـدامانی ڕێکخـستن تایبـەت لەکۆمەڵەی (الاخوان المسلمين) یەکتر بناسن لە (٨) کـەس تێپـەڕ ناکـات، ئـەم شـانە هێـشووییانە بەسـتراونەتەوە بـە سـەرکردایەتی بـاڵای کۆمەڵـەوە، ئـەم کارە ڕێگا خۆش دەکات بۆ جولەی خێراو بەپەلە، هەروەها جێ بـەجێکردنی ئەو ئامۆژگاریانەی لەسـەر کردایەتیـەوە پێیـان دەگـات بەشـێوەیەکی ڕێـك و پێك و کارا.

## جۆری سەرکردایەتیەکان لەناو پەیکەری ڕێکخراوەیی : ( ٧٤ )

لەسەر ئاستی ستراکتوری ڕێکخراوەیی هەر حزب وڕێکخراوێکی سیاسی چەندین سیستمی ناوخۆیی جۆراو جۆریان هەیە، بەپێی ئەو شێوازە پێرەوەی زیاتر باوە لای زۆرینەی حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانی جیان، سێ ئاستی ڕێکخراوەیی بەدی دەکرێت:

### ئاستی یەکەم //

بریتیە لەبنکەکانی ڕێکخستن، شانەکان (کە جۆراو جۆرن لەرووی ژمارەو دەسەڵات و ناوچەی جوگرافی)، بڵاو بوونەتەوە لەگوندو گەڕەك و ناوچەکان، ئاستی سەرکردایەتی و دەسەڵات لەم چوار چێوە ڕێکخراوەییە بەگشتی لاوازە، تەنها بوارەکانی جێ بەجێکردنی ڕێنمایی و بڕیارەکان دەگرێتە خۆی.

### ئاستی دووەم //

بریتیە لەئاستی لق و مەکتەبە ناوەندییەکان، ئەرکی سەرشانیان بەڕێوەبردنی ئەو ئۆرگان و ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتیانە لەچوار چێوەی سیاسەتی گشتی حزب و پێرەوی ناوخۆی حزبەکە.

### ئاستی سێیەم //

بریتیە لەئاستی نیشتمانی کەئەنجومەنە باڵاکانی حزب دەگرێتەوە، وەك کۆمیتەی سەرکردایەتی، مەکتەبی سیاسی.

لەم ئاستەدا دوو جۆرە نموونەی سەرکردایەتی بەرچاو دەکەوێت، سەرکردایەتی بەکۆمەڵ کەخۆی دەنوێنێ لەراپەراندنی کاروچالاکیەکان لەناو مەکتەبی سیاسی حزبەکان.

سەرکردایەتی تاکڕەوی کە خۆی دەنوێنێ لەدەسەڵاتەکانی سکرتێری گشتی یان سەرۆکی حزب.

زۆرترین لایەن بایەخی پێبدرێت لەو سیستمە ناوخۆییانە، پەیوەندییە ناوخۆییەکانە (پەیوەندییەکانی دەسەڵات) لەنێوان لایەنەکانی هاوکێشەی دەسەڵات، ئەو پەویەندییانە پەیوەستن بەدوو لۆژیکی جیاوازەوە:

١) کارتێکردنی بارو دۆخەکە :

لەراپەراندنی کاروباری رۆژانە لەناو حزب و رێکخراوە سیاسیەکان، بەزۆری پێویستیان بەبڕیاری خێراو دەستێوردانی بەپەلە هەیە، ئەم بوارە وادەخوازێت کە کەسەکان هەڵگری زانیاری قوڵ بن دەربارەی دەرامەت و کاروبارەکانی حزب سەرەڕای باری هۆشیاری و تێگەیشتنی ئەندامان.

هەروەها پێویست بەبوونی کەسانێك دەکات کە خۆیان بۆ کاروباری حزب تەرخان کردبێ، لەبەر ئەو هۆیانە دەسەڵاتەکانی سەرکردایەتی لەبنکەکانەوە دەکشێت بەرەو لوتکەو لە لوتکەشدا لەناو ئەندامانی ئەنجومەنێك لەبازنەیەکی تەسکی نێوان چەند ئەندامێك دەمێنێتەوە.

٢- ململانێیەکانی نێوان ئاراستەکان، ناکۆکیەکانی نێوان ئەندام و گروپەکان لەماوەی توێژینەوەکان دەربارەی ژیانی حزبی و

شێوازەکانی سەرکردایەتی، بەشێوەیەکی گشتی، چەند شێوازێك یان چەند جۆرە سەرکردایەتیەك بەدی کراوە، گرینگترین ئەو جۆرانە :

أ) حزبی خاوەن سەرکردایەتیەکی کاریزمی :

لەم شێوازەدا دەسەڵات لەلوتکەوە شۆڕ دەبێتەوە، بەرپرسەکانی لەهەموو ئاستەکانی دەسەڵاتیان لەسەرکردەی باڵاوە وەردەگرن.

ب) حزبی جەماوەری خاوەن سەرکردایەتی دیموکراسی:

ئـەوەی لێـرەدا سـەلمێنراوە بنکـەکانی حـزب ئاراسـتەو بـۆ چـوونەوەکانی حـزب دیـاری دەکـەن، بەهـەموو توانـاو سـەروەریەك سـەرکردەکان دیـاری دەکـەن، لـەم بارەدا پێویستە پێرەوی ناوخۆی حزب چەندین پرەنیـسیپ و رێنمـایی دارێـژێت لـەپێناو هەلبـژاردنی بەرپرسـەکان لەهـەموو ئاسـتە رێکخراوەییـەکان، هـەروەها دانـان بە مافی بیرو بۆ چوونە جیاوازەکان و بنـەمای سـەرکردایەتی بـە کۆمـەڵ بەپێی هەل و مەرجی ناوچەیی.

ج) ئـەو حزبانـەی کەسـەرکردە و بەرپرسـەکانیان دیـاری دەکرێـت، ئـەو حزبـە سیاسـیانەی کـە بەرپرسـە هەڵبـژێراوەکان دەسـەڵاتیان بەدەسـتەوەیەو بـەکاری دەهێنن لەڕووی ئۆرگانێکی حزبی کەم ژمارە.

# باسی چوارەم

## ڕۆشنبیری لەنێو ئۆرگانەکان ( ئایدیۆلۆژیای حزب )

ئەگەرچـی ئایـدیۆلۆژیای حزبـی لـەم سـەردەمەدا بایـەخی ڕابـردووی خـۆی لەدەسـتداوە بـەڵام هێـشتا لەتۆژینـەوەی حزبـە سیاسـیەکاندا باسـی دەکـرێ و دەکرێـت بـەپێی بنـەمای ئـایـدیۆلـۆژی بـاس لـەجۆری حزبـە سیاسـیەکان بکرێت. (٧٥)

توێـژەر (ئیدمونـدبۆرك) گرینگـی بـەرۆڵ و پێگـەی ئایـدیۆژیا داوە لەپێکهاتـەی حزبی سیاسی، ئەم توێژەرە بەم جۆرە پێناسەی حزبی سیاسی دەکات.

حزبی سیاسی کۆمەڵەی کەسانێکی ڕێکخراون لەسەر بنەمای (ئایدیۆلۆژیا)یـەکی هاوبـەش کــە لــەدەوری کۆبوونەتــەوە، بــۆ ئــەوەی بەئاراســتەی پاراســتنی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان کاربکەن.

توێژەرێکی تر بەناوی (تیبۆلت) لەو باوەڕەدایە کە حزبە سیاسیەکان شتێك نین جگە لە (بیروباوەڕی هاوبەش) .

هەندێك لەتوێژەران دەربارەی گرینگی ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیا تا ئەو ئاستە چوونەتە پێشەوە کە بەبەلێنی مانەوەو سەقامگیری حزبەسیاسیەکانیان دەزانێ.

(کلوس فۆنی بیمی) لەو باوەڕەدایە کە تـەنها حزبـە ئایدیۆلۆژییـەکان دەتـوانن هیواداربن بەژیانێکی سەقامگیر لەکۆمەڵگەدا، بەپێچەوانەی حزبـەکان تەمـەنیان

کورت دەبێ و ئەو حزبانەی کەئامانج و ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراویان نییە لەبەردەم مەترسی نەمان و لەناو چووندان.

لەروانگەی ئەم توێژەرەوە بەدرێژایی رۆژگار ئایدیۆلۆژیا فاکتەری سەرەکی سەقامگیری حزبەکان بووە.

بەلاّم ئایدیۆلۆژیا لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بایەخی پێشووی خۆی لەدەستداوەو ئەمرۆ زۆرێك لەحزبە سیاسیەکان بۆی ئەوەی بتوانن لەناو توێژەجۆراو جۆرەکانی خەلّکدا دەنگدەر بۆ خۆیان پەیدا بکەن خۆیان لەپەسەنکردنی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو دوور دەخەنەوە .

توێژەرو پسپۆری ئەمریکی (جاندا) ژمارەیەکی زۆری حزبەکانی خستۆتە بەرتۆژینەوەو دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەنیوەی ئەو حزبانەی توێژینەوەی لەسەر کردوون هیچ ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەتیان وەك ئامانجی حزبی خۆیان هەلّ نەبژاردووەو.

بەگشتی تائێستاش پسپۆرانی ئەم بوارە پێدادەگرن لەسەر رۆلّ و پێگەی ئایدیۆلۆژیا لەحزبە سیاسیەکان و لەو باوەڕەدان کە ئایدیۆلۆژیای حزبەکان تەنانەت کاریگەری لەسەر پێکهاتەو رێکخستنی حزبیشدا هەیە .

(کنیس جاندا) حزبە ئایدیۆلۆژییەکان بەکلێسا دەشوبهێنێ کە خاوەن دیسپلین و رێکخستنی ناوەدێتی و زنجیرەی بەرپرسیارێتی ڕاست و تەواون و ئەندامانی حزب لەسەریانە دیسپلینی حزبی لەبەر چاو بگرن.

بەسەر نجدان لەرۆلّ و گرینگی ئایدیۆلۆژیاو کاریگەرێتی لەسەر پێکهاتەو رێکخستنی حزبەکان گەلێك لەپسپۆرانی حزبە سیاسیەکان ئایدیۆلۆژیایان کردۆتە بنەمای پۆلینکردن بۆ حزبەکان.

(موریس دووفریچیە) لەم بارەوە حزبە سیاسیەکانی لەڕووی ئایدیۆلۆژیاوە بەسەردوو گورپی چەپ و ڕاست پۆلین کردووە. (٧٦)

لەو پۆلین کردنی گشتیدا هەندێ کەس حزبە سیاسیەکانیان بەسەر حزبە ئایدیۆلۆژیاکان و حزبەکانی ڕای گشتیدا پۆلین کردووە، حزبەکانی ڕای گشتی ئەو حزبانەن کە بەهیچ جۆرە ئایدیۆلۆژیایەك ڕازی نابن و بایەخی سەرەکی بەدەنگ دان دەدەن بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بێنن.

لەکاتێکدا حزبە ئایدیۆلۆژییەکان هەوڵ دەدەن کە بەپەرەپێدانی بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیای خۆیان بگەنە ئامانج.

حزبەکانی ڕای گشتی بەپێچەوانەی حزبە ئایدیۆلۆژییەکان پتر پشت بەدەنگدەران دەبەستن و کەمتر لەدوای ڕاکێشانی ئەندامانن، لەکاتێکدا حزبە ئایدیۆلۆژییەکان خاوەن ئەندامانی نەگۆڕن و لەڕووی بیرو باوەڕەوە وابەستەن بەحزبی سیاسی خۆیان.

حزبەکانی ڕای گشتی بەزۆری (بان چینایەتین) و خاوەن ڕێکخستن و ڕێکخراوی حزبی زۆر لاوازن و خوازیاری پاراستنی ئەو ڕەوشەن کە لەئارادایە.

حزبە ئایدیۆلۆژیاکان بەپێچەوانەی حزبەکان ڕای گشتی لەسەر چەند بنەمایەکی نەگۆری ئایدیۆلۆژی بنیاتنراون و بنەماکانی بیروباوەڕ، بۆ ئەم حزبانە لەپلەی یەکەمی گرینگیدایە، ئەم حزبە سیاسیانە بۆ بەرگریکردن لەهەندێ بەهای تایبەتی دروست دەبن و بەرگری لێکردنیان بەگرینگترین ئامانجی خۆیان دەزانن.

## ئایدیۆلۆژیا....مێژوو چەمك : (٧٧)

یەکەم کەس زاراوەی ئایدیۆلۆژیای بەکار هێنا زانای فەرەنسی (ریستات تریسی) بوو کەلەسالآنی (١٧٥٥ – ١٨٣٦ ز) ژیاوەو لەکتێبەکەیدا ( Elements of idelogy) باسی کردووە.

مەبەستی تریسی لەزاراوەی ئایدیۆلۆژیا زانستی بیروباوەڕەکانە، یان ئەو زانستەی لەباری دروستی یاخود هەڵەی ئەو بیرو باوەڕانەی لای خەڵکن دەکۆڵێتەوە.

لەناو کۆمەڵگەکانداو بەهۆی ژیانی ئازاد هەل دەڕەخسێ بۆ دروست بوونی یاخود هاتنەکایەی بیروباوەڕی نوێ و جیاواز هەروەها بەهۆی فرەیی چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵ ئایدیۆلۆژیا و بیرو بۆ چوونی جیا جیا دروست دەبێت، بێ گومان ئەو ئایدیۆلۆژیایە یان بیروباوەڕە جودایە کارتێکردنی بەسەر چالاکی دەربڕینی بیرو بۆ چوونەکانیاندا دەبێ دەکرێت چەمکی ئایدیۆلۆژیا بەپێی ئەو بوارانەی تیادا بەکار دێت دابەش بکرێت بەسەر : (٧٨)

١- بواری ململانێی سیاسی.
٢- بواری سوسیۆلۆژی، ئەم بوارە کۆمەڵی بیرو بەهادەگرێتە خۆی لەئاست : مێژوو، سیاسەت، ژیان و پەیوەندییەکانی ناوکۆمەڵگە.
٣- بواری ئەپستۆلۆژی : کە خۆی وەك کارێکی مەعریفی دەنوێنێ.

ئایدیۆلۆژیا وەك ڕۆشنبیری بەزۆر ماناو لێکدانەوەی ناکۆك دەناسرێ، تێگەیشتن لەم چەمکە ئالۆزی پێوە دیار دەبێ بەهۆی ئەو ڕاستیەی کە زۆر جار بۆ باسکردنی ڕۆشنبیری یان لە جێگای خودی ڕۆشنبیری بەکار هێنراوە، ئەگەرچی هەر دوو زاراوەکە لەیەك ناچن.

## پەیوەندی نێوان چالاکی ڕۆشنبیری و ڕێکخستن :

ئایدیۆلۆژیا ئەو بنەما هزرییەیە کە حزبی سیاسی پشتی پێدەبەستێ بۆ نەخشەکێشانی سیاسەتەکانی و لەبەر ڕۆشنایدا ئامانج و شێوازە جۆراو جۆرەکانی چالاکیەکانی دیاریدەکات.

ئایدیۆلۆژیا ڕێبەری چالاکیەکانی هۆشیاری و ئاگادار کردنەوەیە هەروەها وەلام و ڕێگای چارەسەری کێشە بنچینەییە کۆمەلایەتی و ئابوری و سیاسیەکانی حزب دیاریدەکات لەناو کۆمەلگەدا.

أ) لەخەسلەتە هاوبەشەکانی پەیوەندی نێوان ئایدیۆلۆژیاو کاری ڕێکخراوەیی:

١- پەیوەندی نێوان ئایدیۆلۆژیاو ڕێکخستن ڕەنگدانەوەی پەیوەندی نێوان تیۆرو پراکتیکە. (٧٩)

٢- ئایدیۆلۆژیا ئامرازی کارتێکردنی هزرە بەسەر هۆشیاری و ڕەفتاری ئەندامان و سەر بنکەکانی ڕێکخستن . (٨٠)

٣- بەبێ ڕێکخستنی هۆشیارانەو لەبار ناکرێت تیۆر بێتە دی. (٨١)

٤- پەیوەندیکردنی نێوان ئایدیۆلۆژیاو کاری ڕێکخراوەیی دوو شێواز وەردەگرێت:

أ) پەیوەندییەکی ڕاستەو خۆ واتە کارتێکردنێکی ئالّ و گۆڕی ڕاستەو خۆی نێوان هەردوولا .

ب) پەیوەندییەکی ناڕاستەو خۆ بەهۆی حزبەوە لەماوەی ئەرك و ئامانجە دیاریکراوەکان بەدی دێت.

٥- ئایدیۆلۆژیا بنەماکانی ڕێکخستن و پرەنسیپەکانی کاری ڕێکخراوەیی و شێوازی چالاکیەکانی دەسەپێنێ، بەپێچەوانە ڕێکخستن تووشی گرفت دەبێت.

٦- هۆشیاری ڕۆلی خودی ئەندام، کارتێکردنی گەورەی دەبێت لەم پەیوندییە ، بازنەی پەیوەستی هۆشیاری و چالاکی ئەندامانی ڕێکخستن دەبێت.

ب) ئامانجەکانی چالاکی ئایدیۆلۆژی لەناو ڕێکخستندا:

چالاکی ئایدیۆلۆژی بۆ حزبی سیاسی چالاکیەکە هەموو ئۆرگان و ئەندامان پێی هەلّدەستن و لەڕێگای ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و چاپەمەنیەکان و کارە ئاساییەکانی ڕۆژانەی ڕێکخستن کەباسی بابەتەکانی تیۆری و ئەرکەکان و بیرو بۆ چوون و لایەنەکانی ڕاگەیاندن دەگرێتەوە، ئەم چالاکیە بواری جۆراو جۆری

دەبێت وەك: رۆشنبیری، فێرکردن، تێگەیشتنی کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسیەکانی ناو کۆمەڵگە.

بۆیە پێویست دەکات رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت و گرینگی بە شێوازی بەڕێوەبردنیان بدرێت:

١- رادەی فراوانی ئەو چالاکیە، لەبەر ئەوەی ئەندام و جەماوەری رێکخستن دەگرێتەوە بەمەبەستی راڤەکردنی سیاسەت و ئامانج و ئەرکەکان.

٢- جۆراو جۆری ئامانج ئەرکەکانی چالاکی ئایدیۆلۆژی کە رووداوەکانی چەندین قۆناغ لەژیانی حزب و کۆمەڵگەو ململانێ نێو دەوڵەتی دەگرێتەوە .

٣- بۆیە چالاکی ئایدیۆلۆژی چالاکیەکی فراوانەو رەگەزێکی سەرەکیە لە چالاکی گشتی حزب کە ئامانجی بنچینەیی ئەم چالاکیە چەسپاندنی بنەماکانی سیاسەتی حزب و بلاوکردنەوەی سەلماندنی راستیەتی و پارێزگاری لێکردن و یارمەتی دانە بۆ سازدانی و رێکخستنی جەماوەر.

**دەکرێت ئامانجەکانی چالاکی ئایدیۆلۆژی لە ناو رێکخستنی حزبی سیاسی لەم چەند خاڵانە کورت بکەینەوە:** ( ٨٢ )

١- باوەرپێهێنانی جەماوەر بەراستی و دروستی سیاسەتی حزب، (رەوا پێدان بەسیاسەتی حزب).

٢- کۆکردنەوەو پەروەردەکردنی ئەندام و دۆستەکانی و بەرزکردنەوەی ورەو باوەڕیان.

٣- ئەم چالاکیە کارتێکردنی بەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی (کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابوری، دەروونی) دەبێت بۆیە جێگەیەکی گرینگ دەگرێتەوە .

٤- جیاکردنەوەو دابەشکردنی جەماوەر لەنێوان دۆست و ڕکابەر لەڕێگەی هاندان و خۆسازدان، هەڵوێست بۆ ئەندامان ئامادە دەکات.

ج) تایبەتمەندییەکانی چالاکی ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆژی لەناو حزبە سیاسیەکاندا :

١- لەدیدی سوسیالستیەوە، ئایدیۆلۆژیا بوارێکی ململانێی نێوان چینەکانە، لەجولانەوەی مێژوودا ڕۆڵی تایبەتی خۆی هەیە.

٢- خەباتکردن دژی دوواکەوتن و پاشکۆیەتی و کۆنەپەرستی و داگیرکاری، ئایدیۆلۆژیاو تێکۆشکان و ململانێی کۆمەڵایەتی ئاوێتەن و لەگشت بوارەکانی سەرخانی کۆمەڵایەتیدا ڕەنگ دەدەنەوە، ئایدیۆلۆژیا لەبڵاوبوونەوەی لەناو چینی زەحمەتکێش ڕەگ و ریشەی دادەکوتێت و دەبێتە هاندەرێك بۆ هێزی تێکۆشان. (٨٣)

٣- لەباوەرهێنان بەگۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکان گۆڕانکاری بەسەر ڕۆشنبیریدا دێت بەڵام لەسەر خۆو درەنگتر.

٤- هەموو ئایدیۆلۆژیاکان لەیەك سیمادا هاوبەشن، ئەویش شێوازی سۆزدارانەی و سروشتە بزوێنەرەکەی بۆ بیرو هەستی جەماوەر، ئایدیۆلۆژیا ئامرازی کارتێکردنی هزرییە بەسەر هۆشیاری و ڕەفتاری جەماوەر.

٥- لە ئایدیۆلۆژیا کەسایەتی مێژوویی (کاریزما) ئەو سمبولەیە کە لەووەوە بەرژەوەندییەکان بایەخی پێدەدرێ، و بەجەستە دەکرێ. (٨٤)

د) ئەرکی سەرکردایەتی حزب لەئاست چالاکی ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆژیدا :

١- پێویستە کاری ئایدیۆلۆژی هاوسەنگبێت لەگەڵ سیاسەتی گشتی حزب و بەڵکو بەشێکی بێت.

٢- بەکار هێنانی شێوازی ڕۆشنبیری و زانستیانە لەچالاکیە جۆراو جۆرەکان.
٣- لەئامادە کردنی کادیران پێویست دەکات بەرنامەیەکی زانستیانە هەبێ لەبواری ئامادەکردن و شێوەی دابەشکردنیان بەپێی پسپۆری.
٤- پارێزگاریکردنی یەکگرتوویی هزری و ڕێکخراوەیی و پابەندبوون بە بنەماکانی.
٥- دەستەبەرکردنی زانیارییە پێویستیەکان دەربارەی هەڵسوراندنی کاروچالاکیە هزری و ڕۆشنبیرییەکان و ئەو کارو بارانەی مێشکی خەڵکی پێوە سەرقاڵ بووەو چۆنیەتی تێگەیشتنیان بۆ سیاسەتی حزب.
٦- بوونی چاو دێریکردن دەربارەی ڕادەی کارتێکردن و سەرکەوتنی چالاکیە ڕۆشنبیری و هزرییەکان و هەڵسەنگاندنیان.
٧- بەشداری پێکردنی هەمووان لەوچالاکیانە (ئۆرگان – ئەندام) و بەهەموو شێوازێك.

هـ) پەیوەندی لۆژیکی نێوان چالاکی هزری و ئایدیۆلۆژی لەگەڵ چالاکی ڕێکخراوەیی:

چالاکیەکان لەبواری ڕێکخستن دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی: یەکبوون و کاریگەرێتی چالاکیە هزرییەکان بەهەموو ڕەگەزەکانی وەك : چالاکی تیۆری، چالاکی ڕاگەیاندن، چالاکی ڕێکخراوەیی، چالاکیە سەرکردایەتیەکان، کارتێکردن لەسیستم و هونەرو ڕۆشنبیری .

ئایدیۆلۆژیا بەرۆلی خۆی دەبێتە فاکتەرێك بۆ ئەوەی چالاکی بۆرەگەزەکانی ڕێکخستن دابین بکات : ئەندامان، ئۆرگانەکان، سیستم و پرەنسیپەکان، بەرزی ئاست و توانای کارتێکردن بەجۆرێك کە توانای ئامادەکردن و سازدانی هێزو تواناکانیان هەبێت. (٨٥)

چەندی بیروباوەڕو ئەوچەمکە هزرییانەی ڕێکخستنی لەسەربنیات نرابێ زانستیانە بێت، ئەوا کاریگەری و ڕەنگدانەوەی و تێگەیشتنی زیاترو باشتری دەبێ.

بەکورتی کاروچالاکیەکانی ئایدیۆلۆژیا یارمەتیدەری کاروچالاکیەکانی ڕێکخستن دەبێت لەم بوارانەدا :

١- بنیاتنان و دیاریکردنی شێوازە پێویستیەکانی ڕێکخستن و پێکهێنانی بەپێی سیاسەتی حزبەکەو دەستەبەرکردنی کاریگەرێتی.

٢- یارمەتیدان لەبواری پەروەردەو گەشەپێدانی کادیرانی سەرکردایەتی و کادیرە پێشکەوتووەکان کارتێکردن لەپەروەردەی ئەندامان و بەرزکردنەوەی ئاست و تواناکانیان.

٣- کارتێکردنی بەسەر دەوروبەری ئۆرگانە حزبیەکان دەبێت، بەجۆرێك کار ئاسانی بۆ ئۆرگانەکانی دروست دەکات لەناو جەماوەر.

٤- یارمەتی دان لەماوەی ئامادەکردنی پلانەکان ودیاریکردنی سیاسەتی گشتی.

٥- کارتێکردنی دەبێت بەسەر پەیوەندییە حزبی و سیاسەتەکانی ناو خۆو دەرەکی.

# باسی پێنجەم

## بڕیار وەرگرتن لەئۆرگان

پرۆسەی وەرگرتنی بڕیار لەهەربوارو دەربارەی هەرکێشەیەك بێت پرۆسەیەکی گۆشەگیر نیە، بەڵکو گرێدراوە بەکێشەو ناکۆکی و ململانێیەکان.

پرۆسەیەکی بەردەوامە بەمەبەستی دیاریکردنی ئامانجەکان بەباشترین شێوەی بەکار هێنانی دەرامەت و تواناکان لەچاکترین هەل و مەرجی پەیوەندار.

بوونی کێشە وەك مەرجێکی بنچینەیی بۆ هەر بڕیارێك، وای لەهەندێ کەس کرد کە ناو لەبریار بنێ بەچارەسەرکردنی کێشەکان.

وشەی بڕیار لەراستیدا بەمانای یەکلاکردنەوەی کێشەیەك یان ناکۆکیەك دێت، لەئۆرگانەکان و لەلایەن بەرپرسان رۆژانە چەندین بڕیاری جۆراو جۆر دەدرێت دەربارەی کێشەو بابەتی جیاوازو لەماوەی بارودخۆی جیاوازدا، هەندێ لەو بڕیارنە دژوارن و پێویستی بەرەنج و دەرامەتی زۆرو شیکردنەوەی زانستیانە هەیە، هەندێکیان ساکارن تەنها کاری رۆتینی دوبارەکراوە.

زانستی سیاسەت لای هەندێك بەزانستی بریاردان دەزانرێ وتیۆرسازی دەربارەی بڕیاردان دەکەن، بر یاردان بەمانای یەکلاکردنەوەی ئیرادەیەکی سنوردار، دەربارەی کە ئایا چی بکرێت لەئاست دۆخێکی تایبەت و گەیشتن بەئەنجامێکی دیاریکراوی کۆتایی. (٨٦)

وەك هاوکێشەیەك : کاریگەری بڕیار یەکسانە بەجۆری بڕیارەکە جاران رادەی پەسند کردنی

توێژەران بڕیاریان بەچەندین شێوە پۆلین کردووە، دەکرێت ئاماژە بۆ چەند جۆرێکی گرینگ بکەین : (٨٧)

١- بڕیارە تەکنیکی و بڕیارە ستراتیژییەکان.
٢- بڕیارە بنچینەیی و بڕیارە رۆتینیەکان.
٣- بڕیارە رێکخراوەیی و بڕیارە کەسایەتیەکان.
٤- بڕیارەکانی بەبەرنامەو بڕیارەکانی بێ بەرنامە.
٥- بڕیارە داهێنەرەییەکان. (کەدەبێتە هۆی گۆرانکاری).
٦- بڕیارە پرمەترسییەکان (کەدژوارو پرکێشەیە).

## چوار چێوەیەك بۆ دروستکردنی بڕیار : (٨٨)

ئەم باسە سێ بابەت دەگرێتە خۆی بریتین لە :

١- دیاریکردنی دروستکەرانی بڕیار :

یەکێك لەتەوەرەکانی میتۆدی دروستکردنی بڕیار بریتیە لەرۆشنایی خستنە سەر توێژی ئەو بکەرە سیاسیانەی پێیان دەوترێت دروستکەرانی بڕیار.

لەهەموو سیستمێکدا چەند دەروازەیەك یان چەند کەسێك هەن کە بڕیارەکان دروست دەکەن، ئەمەش پێویستی بەلێکۆلینەوەی پێکهاتە یان پێشینە یاخود خاسیەتە کۆمەلایەتیەکانی دروستکەرانی بڕیار هەیە.

٢- شێوازەکانی هەڵبژاردنی دروستکەرانی بڕیار :

هەموو سیستمێکی سیاسی شێوازی خۆی هەیە لەهەلبژاردنی سەرکردە سیاسیەکاندا ئەم شێوازە لەسیستمێکەوە بۆ سیستمێکی تر دەگۆڕێت، لەهەندێ کۆمەڵگەی جەماوەری دەنگدەران بەهێزو کاریگەرن و دەنگدان قۆرخ نەکراوە بۆ کەرتێکی دیاریکراوی دانیشتوان، لەهەندێ کۆمەڵگەی تریشدا تەنها کەرتێکی دیاریکراو بەدەنگدەران دادەنرێن.

٣- ئەو فاکتەرانەی کاردەکەنە سەرپرۆسەی دروستکردنی بڕیار:

دروستکەرانی بڕیارکاری خۆیان لەچوارچێوەی واقیعێکی کۆمەڵایەتیدا لەلایەك لەگەڵ واقیعێکی سیاسی و دامەزراوەیی لەلایەکی ترەوە ئەنجام دەدەن، واقیعی کۆمەڵایەتی گۆڕاوەکان دەگرێتەوە، لەشێوەی رای گشتی و هێزە کۆمەڵایەتیەکان و شەپۆلە هزرییەکان دەگرێتەوە.

چوارچێوە سیاسیەکەش کۆمەڵێك بنەمای ڕێکخراوەیی دەگرێتەوە، ئەم دۆخە بەهەردوو لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی، کاریگەر دەبن لەسەر رەفتاری بریار دروستکەران هەیەو ئەوانیش کاریگەرییان لەسەر بارودۆخەکە هەیە.

لەوەرگرتنی هەر بڕیارێك سێ فاکتەر رۆڵی سەرەکی دەگێڕن ئەوانەش :

١) رادەی ئەو زانیاریانەی لەبەر دەستن و دەکرێت سوودیان لێ وەربگرێت.

٢) هۆکارە دەروونی و مرۆڤایەتیەکانی لای کەسی بڕیار دەر.

٣) هەل و مەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناو کۆمەڵگەو ئەوی کارتێکردنی بەسەر ئۆرگان و کەسەکان هەیە.

## هەنگاوەکانی دروستکردنی بڕیار :

لەهەموو سستمێکی سیاسیدا چەند ڕێوشوێنێك هەیە بۆ بڕیاردان، پرۆسەی دروستکردنی بریار ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەگرێتە خۆی:

١- دیاریکردنی کێشەکان : (٨٩)

لەسیستمە سیاسیەکاندا ئەم کارە لەرێگای گفتوگۆو توێژینەوە ئەنجام دەدرێت، کەناڵەکانی راگەیاندن، پارتەکان، سەندیکاکا، زانکۆکان، سەنتەرەکانی لێکۆلینەوە....هتد بەشداری تیادا دەکەن.

٢- گەیشتن بەچەند بیروڕایەك :

لەئەنجامی گفتوگۆکاندا دروستکەرانی بڕیار چەند بیرو بۆچوون و ئایدیایەك بەدەس دەهێنن دەربارەی ئەوی پێویستە بۆ روبەروو بوونەوەی کێشەکە بکرێت.

لەهەندێ سیستمدا بیروکراسیەت ئامرازێکی گرینگە لەدابینکردنی زانیاریەکان بۆ دروستکردنی بڕیار، بەڵام رەنگە ئەو زانیاریانە بشاردرێنەوە، ئەو کارە دەبێتە هۆیەك بۆ دروستبوونی کۆسپ لەبەردەم پرۆسەی دروستکردنی بڕیار.

٣- پۆلینکردن و لێکدانەوەی زانیارییەکان و خەملاندنی هەموو چارەسەرە بەدیلەکان، پێویستە لەسەر دروستکەری بڕیار ئاگای لەهەموو هەلبژاردنە شیاوەکان بێت، پێویستیش دەکات لەگۆشەنیگای ئەنجامە گریمانە کراوەکانەوە بیربکرێتەوە.

٤- جێ بەجێکردنی بڕیار :

دوای بریاردان، پرۆسەی جێ بەجێکردن دەست پێدەکات، ئەمەش پرۆسەیەکی ئالۆزەو وەك پرۆسەی دروستکردنی بریار وردەکاری زۆری تێدایە.

جێ بەجێکردن پێویستی بەزنجیرەیەك بڕیاری لاوەکی هەیە، پرۆسەی جێ بەجێکردن لەبنەڕەتدا پشت بەدەزگای ئیداری دەبەستێت، ئەم دەزگایەش هەندێ جار بەرچاوی روون نیەو ئامانجەکانی بڕیارەکە بەباشی نابینێت، بێ گومان ئەو کارە دەبێتە هۆی بێسەرو بەری پرۆسەی جێ بەجێکردن و شێواندنی ئامانجەکە.

٥- هەڵسەنگاندنی بڕیار :

ئەم لایەنەش بوارێکی گرینگە و پێویستە هەموو ئەوانەی پێرەوی دروستکردنی بڕیار جێ بەجێ دەکەن بۆ لێکۆلینەوەی سیاسی ئاگاداربن، کاری هەلسەنگاندنیش چەند پێوەرێکی هەیە:

أ) دۆخی زانیاریەکان :

ئایا ئەو زانیاریانەی لەبەردەستی بریار دروستکەراندا هەیە تەواون یان ناتەواون و شێواون.

ب) پلەی راوێژکردن لەماوەی دەرکردنی بڕیارەکەدا:

ئایا بریارەکە دوای راوێژکردن و لێکۆلینەوە دراوە، لێکۆلینەوە لەگەڵ چەند و چ ئەندامێك، کادیرێك، ئۆرگانێك کراوە.

ج) گرینگی یان پێویستی بڕیارەکە.

د) ئاسەوارو ئەنجامەکانی بڕیارەکە، ئایا مەبەستی بریارەکە هاتۆتەدی؟

کارلێکردنەکانی پرۆسەی دروستکردنی بڕیار :

کارلێکردنەکان لەکاتی ئامادەکردنی بریاری سیاسی چەندین پرۆسەی تێدایە، گرینگترینیان ئەمانەن: دانوستاندن، کێبڕکێ، ململانێ، هاوکاری.

## ١- دانوستاندن :

ژیانی سیاسی پڕە لە دانوساندنی نێوان سیاسەتمەداران، لەنێوان سیاسەتمەداران و هاوڵاتیان، سیاسەتمەداران و گرووپەکانی بەرژەوەندی، سیاسەتمەداران و بیروکراسیەکاندا، بەمەبەستی گەیشتن بەئال و گۆڕکردنی بیروڕای بەسوود بۆ هەردوولایەنی دانوساندنەکە.

پێویستە ئەو کەسەی بەشداری دانوساندن دەکات تواناکانی خۆی و ئەوانی تر بزانێ چەندن، دەبێت سوود لەدۆخەکە وەربگرێت و مامەڵەی لەگەڵدا بکات، هەروەها ئاگای لەئامانجە سەرەکی و لاوەکیەکانی دانوساندنەکان بێت.

## ٢- کێبڕکێ :

بەهۆی ئەم چالاکیە دوولایەن یان زیاتر تێدەکۆشن بۆ بەدیهێنانی هەمان ئامانج، ڕێژەی کێبڕکێ لەڕووی چەندێتی وچۆنیەتیەوە لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی تر، لە ڕێکخراوێکی سیاسیەوە بۆ ڕێکخراوێکی تر دەگۆڕێت، بگرە لەناوهەمان دامەزراوەی کۆمەڵایەتی یان سیاسی یاخود ئابووری دەگۆڕێت، بەپێچەوانەی باری دانووساندکەرەوەکە هەوڵی ڕازیکردنی لایەنەکەی تر دەدات و ڕەوشتێکی سوود مەند بۆ هەر دوولا پەسند بکات، بەلاّم کێبڕکێکەر هەوڵدەدات بەئامانجی خۆی بگات بێ ئەوەی هیچ سوودێك بەنایارەکەی بگەینێت، بەلاّم هەندێ جار ڕوودەدات کەدوولایەنە کێبڕکێکەرەکە بۆ پاراستنی بوونی خۆیان دەگەڕێنەوە بۆ حالەتی دانوساندن.

## ٣- ململانێ :

ئەمە کاتێك ڕوودەدات کە ئامانجەکانی هەردوو بکەرە سیاسیەکە ڕاستەو خۆ ناکۆك دەبن، لەبارێکدا کە سەرکەوتنی لایەنێکی ململانێکە بەبەزینی ڕاستەو

خۆی ئەوەی تریان تەواو دەبێت، زۆر جار ڕوو دەدات ململانێکان وێرانکار دەبن، بەتایبەتی ئەگەر لایەنەکان نکۆڵیان لەئامانجەکانی یەکتری کرد یان پشتگوێیان خست، زۆر جاریش لەبەر ئەوەی باجی بەردەوامبوون لەسەر ململانێ زۆرە، لایەنەکان تێدەکۆشن بەدانوساندن گرفتی نێوانیان چارەسەربکەن.

### ٤- هاوکاری :

هیچ سستمێکی سیاسی ناتوانێت نکۆڵی بکات لە ئاست ئەوەی کە ئامانجەکانی لایەنە جیاجیاکان ناکۆکن، بەڵام ئەو ڕاستیەش هەیە کە ئامانجێکی هاوبەش هەیە هاوڵاتیان لەپێناویدا کار دەکەن، بۆ ئەوەی هاوکاری ڕووبدات پێویستە بەلایەنی کەم لایەك دان بەوە دابنێت کە ڕێککەتنێك لەسەر ئامانجەکان شیاوەو بەدیهێنانیان نابێتە هۆی زیان بۆ هیچ لایەنێکیان، ئەم بارە پێویستی بەرادەیەك گونجان و هەماهەنگی و ڕاوێژکردن هەیە.

### گرینگترین سەر چاوە ڕەفتارییەکان بۆ وەرگرتنی بڕیار لەناو ئۆرگاندا : (٩٠)

١- بوونی ئیرادە لای وەرگری بڕیار : کارێکی بنچینەییە بۆ هەر کەسێ کەبیر لەچارەسەری کێشەیەك بکاتەوە بۆ جێ بەجێ کردنی ئامانجێك بەهۆی بڕیارێك، خاوەن ئیرادەو توانا بێت، کاتێ ئەو ئیرادەیە بزر دەبێ یان لاواز، ڕق و قین و و ناڕەزایی جێگای بگرێتەوە، ئەوا لێرەدا هەنگاوی دەست پێکردنی جێگای گومان دەبێت و ئەنجامەکانی دروست نابن.

٢- بەهاکان ڕۆڵێکی کاریگەریان دەبێ لەجیاوازی بیرو بۆ چوونەکانی وەرگری بڕیار، یان بەشداربوونی بەهاکان لەهەموو قۆناغەکانی

وەرگرتنی بڕیار ئامادەن و لەر ڕۆشنایی ئەو بەهایانە تاك بڕیار دەدات کە ئایا ئەو هەڵوێستە یان دیاردەکە کێشەیەو پێویست بەبڕیار دەکات.

٣- ئاستی خواست و ئارەزووی تاك پەیوەستیەکی توندی بەرەفتارو بڕیارەکان هەیە، ئەو بڕیارانەی بەکۆمەڵ وەربگیرێت یان بەتاك، ئەوانی خواست بۆ چوونیان بەرزو دوورخایەنە لایەنگیری بڕیاری نموونەیی و بەرز خواستیان دەبێ کە گەورەترین دەسکەوتیان بۆ بهێنێتەدی.

٤- ئەو بڕیارانەی بەکۆمەڵ وەردەگیرێت بەشداری لەبەرز بوونەوەی ئاستی ڕەزامەندیان دەکات، بەبەراورد کردن لەگەڵ ئەو بڕیارانەی کەتاك وەری دەگرێت، هەر چەندی ئەو تاکە لێهاتوو بەتوانابێت.

٥- ئەو بڕیارانەی کە پلەیەکی بەرزی بەشداریکردنی تێدایە و لەهەمان کاتدا دەبێتە جێگای ڕەزامەندی، لەماوەی جێ بەجێکردندا و ردوو باشترو زیاتر کاریگەر دەبێت.

٦- یادەوەری (ذاکرة) ئەو جێگایەیە کە هەموو زانیاری و شارەزاییەکانی مرۆڤی تیادا پارێزراو دەبێ، ئەو یادەوەرییە بەشداری دەکات لەوەی کە مرۆڤ سەرکەوتووتر بەرنامە ڕیزی هەلس و کەوت و بڕیارەکانی بکات، وەك بەدەنگە هاتنێك بۆ ئەو بەهایانەی هانی دەدات و دەی وروژێنێت.

یادەوەری بەو هەموو بەهاو ئاراستەو خواست و زانیاریانەی تیادا کۆبۆتەوە کاریگەری کارای دەبێ بەسەر بڕیارەکانی تاك لەڕووی کەسایەتی و ڕێکخراوەییەوە بۆیە پێویست دەکات پەیوەندییەکانی نێوان هەموو بوارەکانی زانیاری (لە کارگێری و دەروونی) پێك بهێنرێت و هەموو ئەو زانیاریانەی بەنوێی لای مرۆڤ پەیدا دەبن بەکار بهینرێت بۆ تێگەیشتن لەرەفتارو بڕیارە ڕێکخراوەییەکان.

## تایبه‌تمه‌ندی هه‌ندێ پرۆسه‌كانی دروست كردنی بڕیاری حزبی : (٩١)

توێـژه‌ر (ئـالان ویـر) چـوار هۆكـار دیـاری ده‌كـات، كـه‌ ده‌بێتـه‌ هـۆی زاڵبـوونی ده‌سه‌ڵاتی سـه‌ركرده‌كان به‌سـه‌ر حزبـه‌كانیان و دوور كه‌وتنـه‌وه‌یان له‌جه‌ماوه‌ری حزبی، ئه‌و هۆكارانه‌ی بریتین له‌ :

١- پێكهاتـه‌ی ڕێكخراوه‌یـی حـزب به‌تایبـه‌تی له‌حزبـه‌ بـژارده‌كان (نخبـوی) كـه‌ بـه‌گرینگترین هۆكـار داده‌نرێـت لـه‌ڕێگرتن له‌بـه‌رده‌م ئه‌نـدامان بـۆ به‌شداریكردنیان له‌به‌ڕێوبه‌ردنی كاروباری حزب.

٢- هه‌ندێ جار خـودی ڕێكخستن و شێوازی پێكهێنـانی ده‌بێتـه‌ هـۆی دروسـت بوونی ده‌سه‌ڵاتدارییه‌كی كه‌سایه‌تی.

٣- گه‌یـشتن بـه‌حوكمرانی ده‌بێتـه‌ هـۆی دووركه‌وتنـه‌وه‌ی سـه‌ركرده‌كان حـزب، هه‌روه‌ها خواستیان بۆ درێژه‌ پێدان به‌حوكمرانی.

٤- تـه‌كنولۆژیای نـوێی هه‌ڵمه‌تـه‌كانی هه‌ڵبـژاردن، یارمه‌تێدانێكه‌ بـۆ ئـه‌وه‌ی له‌ناوه‌نده‌وه‌ كونترۆڵ بكرێت، به‌ڵكو هه‌ندێ جار كه‌س ڕۆڵی سـه‌ره‌كی لـه‌و هه‌ڵمه‌تانه‌ ده‌گێڕێت له‌جیاتی ئه‌وه‌ی پروپاگه‌نده‌ ئه‌و ڕۆڵه‌ بگێرێت.

له‌وڵاتانی جیهانی سێیه‌م پرۆسه‌ی دروستكردنی بڕیاری حزبـی، هه‌نـدێ سـه‌رنج وتایبه‌تمه‌ندی خۆی هه‌یه‌ وه‌ك:

١) له‌زۆربه‌ی حزبه‌كان سه‌رۆكی حزب (ئه‌میینداری گشتی) پێگه‌یه‌كی جیاكاری ده‌بێـت، ده‌رفـه‌تی ده‌داتـێ كه‌بـه‌ڕۆڵی سـه‌ره‌كی هه‌ڵـسێت لـه‌و پرۆسـه‌یه‌دا، هـه‌روه‌ها ڕێگـر بێـت له‌بـه‌رده‌م به‌شـداریكردنی ئاسـته‌ ڕێكخراوه‌ییـه‌ جـۆراو جۆره‌كان بگره‌ تائاستی سه‌ركردایه‌تی ئه‌گه‌ر سه‌رۆك ئاره‌زووی هه‌بێ.

٢) سـنووردار بـوونی ڕۆڵـی سـه‌ركردایه‌تی له‌پرۆسـه‌ی دروسـتكردنی بڕیـاری حزبی به‌ به‌راوردكردن له‌گه‌ڵ ڕۆڵی سه‌رۆك.

٣) هەروەك ئاشكرایە كەرۆڵی سەركردایەتی سنووردار دەبێ لەپرۆسەی دروستكردنی بڕیاری حزبی بەبەراورد لەگەڵ رۆڵی سەرۆك، كارێكی بەلگە نەویستەكە رۆڵی هەردوو ئاستی ناوەڕاست و سەركردایەتی كەمتر دەبێت.

٤) حزبەكان لەولاتانی جیهانی سێیەم بایەخی گەورە دەدەنە بەستنی كۆنگرەكان.

زۆرینەی بڕیارەكانیش لەكۆنگرە گفتوگۆی لەسەر دەكرێت، بەلام یەكلاكردنەوەیان بەتایبەتی بڕیارە گرینگەكان دەمێنێتەوە بەدەستی سەرۆك، هەروەها دەست نیشان كردنی جێگرەكانی سەرۆك و سەركردایەتی و ئەندامانی مەكتەبی سیاسی حزب.

## ئەو كۆسپانەی دێنە بەردەم و بەرگرتنی بڕیار لەتاوئۆرگان : (٩٢)

١- توانای ئامادەكردنی هەموو بەدیلی و ڕێگا چارەسەر بۆ هەموو كێشەكان و وەرگرتنی بڕیار دەربارەیان كارێكی زەحمەتە، چونكە دەكرێت زیاتر لەیەك بەدیل یان بەچەندین رێگا چارەسەر دیاری بكرێن، ئەگەر گفتوگۆرو توێژینەوە بەردەوام بوو دەربارەیان.

٢- رێ تێچوون بۆ جێ بەجێكردنی هەموو ئەو بەدیل و رێگاچارەسەریانەی پێی دەگەن و بیری لێدەكەنەوە لەهەموو بارێكدا و لەگەڵ ئەوی لەراستیدا روو دەدات وەك یەك نابێت، لەبەر ئەوەی كارەكە هەندێ جار پەیوەندی بەئایندەوە هەیە كە دەكرێت نەزانراو شاراوە بێت.

٣- ئەو بەرپرس و ئەندامانەی كە بەتەنیا بڕیار دەدەن و كۆدەبنەوەو بەیەكەوە بەشداری كاروبارەكان دەكەن، هەموو خاوەن پێش خان و جۆرەها بەهاو تایبەتمەندی خۆیانن، كاریگەری دەبێت بەسەر

تێڕوانینیـان بـۆ دەوروبـەری خۆیـان، ئـەو حاڵەتـەکارتێکردنی دەبـێ لەماوەی وەرگرتنی بڕیارەکان.

٤- بارودۆخی ناو چەیی و زەمانی تایبەت بەسەر دەمی بریار یان تاگەکان یـاخود ئـەو لایەنانـەی کاریگـەر دەبـن پێـوەی یـان کـارتێکردنی لێـی، هەروەها ئەو کەش و ڕێکخراوو سیاسیە باوەی هەیـە لەگەڵ ڕێتکردنـی پرۆسەکانی پێگەیانـدنی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی، ڕۆڵێکـی گـەورەی دەبـێ لەدروستکردنی بەدیل و ڕێگاچارەکان لەکۆمەڵگە جـۆراو جـۆرەکـان یـان لەقۆناغە جیاوازەکان.

٥- بەشـداریکردن لـەوەرگرتنی بریارەکـان پێویـستە بـۆ چاککردنی ئـەرك بەجیگەیانـدن، هـەروەها نیـشانەییکە لەسـەر پەیوەندییـە پۆزەتیڤـەکان ئەگەر چی دژواری هەیە لەپرۆسەی جێ بەجێکردندا.

## هەندێ ڕەفتاری هەڵە لەماوەی وەرگرتنی بریار لەناو ئۆرگانەکان:

١- سەرقاڵبوونی ئەنجومـەنی بـاڵای ئۆرگانـەکان بـەو بڕیارانـەی پەیوەنـدی بەکاروباری ڕۆتینی و ڕۆژانە هەیە، پەککەوتنی لەروو بـەروو بوونـەوەو خۆتـەرخانکردن بـۆ بریـارە گـرینگ و مەترسـیدارەکان، بـەهۆی خراپـی بـــەڕێوەبردنی کـــات و دابـــەش نـــەکردنی ئـــەرك و بەرپرســـاریەتی و دەسەڵاتەکان بەپێی بنەما ڕێکخراوییەکان.

٢- ڕێك نەکەوتن و نارێکی لەسەر ئەو بریارانەی دەرچوونە لەنێوان چەند ئۆرگانێك، بگرە هەندێ جار لەیەك ئۆرگـانیش لـەماوەی چـەندین کـاتی بە دووای یەکدا.

٣- دەست تێوەردانی بەردەوام لەلایەن سەر کردایەتیە باڵاکان بـۆ کاروبـاری ئۆرگانە پسپۆرەکان لەدارشتن و دەرکردنی بڕیارەکان.

٤- بڵاو بوونەوەی چەند جۆرە ڕەفتارێکی نەگەتیڤانەی وەك دووزمانی و مەرایی و هەلپەرستی لای هەندێ لەکادیران.

٥- هەندێ لەبڕیارەکان لێڵ و ئاشکرا نین، زیاتر لەماناو بۆ چوونێك هەڵدەگرێ، یان بەخێرایی ناگاتە جێگای خۆی.

٦- تێنەگەیشتنی هەندێ لەئەندام و کەسانی تر بۆ بابەتەکارراییی و یاساییەکان و شێوازی بەڕێوەبردنی کاروبارە جۆراو جۆرەکان و پێداویستیەکانیان لەگەل ئەو هەنگاوانەی پێویست بەپێرەوکردنن لەماوەی جێ بەجێکردنیان، بەهۆی نەزانین و تێنەگەیشتن لەشێوازی یاسایی و ڕێکخراوەیی.

## چەند نموونەیەك لە پێرەوی ناو خۆی حزبەکان لەسەر شێوازی وەرگرتنی بڕیار :

## یەکەم : حزبی کۆمونیستی عێراقی (٩٣)

وەرگرتنی بڕیار لە سەر ئاستە جیاوازەکان لەناو حزبدا بەرێککەوتنی تەواو یان زۆرینەی دەنگ دەبێت پاش گفتوگۆیەکی ئازادانە، بەمەبەستی دەستەبەرکردنی جێ بەجێکردنی بڕیارەکان و دەولەمەندبوونیان.

ئەم بنەمایانەی خوارەوە لەکاتی وەرگرتنی بڕیار پێویستە پیرەو بکرێت :

١) بڕیارەکانی کۆنگرە و کۆنفرانسەکان، سەرکردایەتی حزب، پێویستە هەموو ئەندام و ئۆرگان و ئەنجومەنە حزبیەکان پابەندی بن.

٢) ئەو بڕیارانەی کەلایەن ئۆرگان و ئەنجومەنە حزبیە جۆراو جۆرەکان وەردەگیرێن، دەبێ هەموو ئەندام و ئۆرگانەکانی خوا رووتر پابەندی بن، هەموو ئەونجوومەنێك بەرپرس دەبێت لە ئاست ئەو بڕیارانەو جێ بەجێکردنیان.

٣) کەمایەتی مافی گفتوگۆکردنی سیاسەت و کاروباری ناو خۆی حزبی هەیە، هەروەها ڕەخنەگرتن لەبەردەم ئۆرگانەکان مافی هەموو لایکە تا دەگاتە کۆنگرە .

دەربڕینی بیرورا دەربارەی کێشە هزری و سیاسیەکان و ڕاگەیاندنی لەرۆژنامەی حزبی، بەمەرجێ ئەو کارە ڕێگر نەبێت لەبەردەم پابەند بوونیان بەو بریارانەو زیان بەحزب نەگەیێنێت.

٤) ئەندام لەئۆرگانەکانی خوارەوە مافی ڕەخنە گرتنیان هەیە لەمەر بڕیارەکانی ئەنجومەنە باڵاکان لەگەڵ داواکردنی چاو خشاندنەوە بەو بڕیارانەو پێشکەشکردنی هۆیەکانی بەمەرجێك ئەو کارە ڕێگر نەبێت لەبەردەم پابەندی و جێ بەجێکردنیان بۆ ئەوبریارانە تاکاتی یەکلاکردنەوەی لەلایەن ئەنجومەنە بالاکان کەدەبێ پابەندی تەماشاکردنی ئەو ڕەخنە و داواکرایانە بن لە ماوەیەکی دیاریکراودا.

## دووەم // پارتی سۆسیال دیموکراتی ئەلمانیا: (٩٤)

١- بەپێی پێرەوی ڕێکخستن (م – ٣٤) بەندی ٢ ، کۆمیسیۆنەکانی بڕیار بەرپرسن لەبریاردان لەسەر :

أ) ڕێ و شوێنە نیزامیەکانی ڕێکخستن :

ب) کێشەو ناهاودەنگی لەسەر بەکار هێنان و لێکدانەوەی پێرەوی ڕێکخستن و پێرەوەکانی ناوخۆ، هەروەها بنەماکانی حزب و ڕێنماییەکانی کۆمەڵەکانی کار .

ج) ڕێ و شوێنەکانی بەتاڵکردنەوەی هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردن.

٢- بۆ ئەو پرسانەی کە بە بڕیارێکی چارەسەری دەمو دەست، بڕیاری هەناردنیان بۆ سەرەوەتر نادرێت، کۆمیسیۆنی بڕیاری بنگەڕەك، وەك

ئۆرگانێکی بەرپرس لەگرتنەبەری ڕێوشوێنە نیزامیەکان بەرامبەر ئەندامانی ڕێکخستنی ئەو شوێنگانەی کە دەکەونە بازنەی بەرپرسیاریەتی خۆی بڕیار دەدات.

٣- کۆمسیۆنی بڕیار لەگەڕەکەکان، لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە بڕیار دەدەن :

أ) وەك ئۆرگانێکی بەرپرسی بۆ پیرەکردنی ڕێوشوێنە نیزامیەکان بۆ ئەو پرسانەی کە پێویست بەبڕیارێکی چارەسەری دەم و دەست دەکات.

ب) بۆ ئەو پرسانەی کەبەبڕیارێکی چارەسەری دەم و دەست نەنێردراون بۆ ئەوان، بەڵام پەیوەنداران تێبینیان لەسەر بڕیاری کۆمیسیۆنی بنگەرەك هەبێت ئەوا وەك ئۆرگانێك بۆ پێداچوونەوە لەگرتنەبەری کاروبارە ڕێکخراوەییەکان بڕیاردەدات.

ج) وەك ئۆرگانێکی بەپرسی لەڕێوشوێنەکانی چارەسەری کێشە پێرەوییەکان لە ناو سنوری ڕێکخستنی گەڕەکەکان.

د) وەك ئۆرگانێکی بەرپرس، لەپرسەکانی بەتاڵکردنەوەی هەڵبژاردن، لەناو سنوری ڕێکخستنی گەرەکەکان ئەگەر پرسەکە پەیوەندی نەبێت بەکۆنفراسی حزب لەگەڕەك یان هەرێم.

٤- کۆمیسیۆنی فیدرالی بڕیار، لەمانەی خوارەوە بڕیار دەدات :

أ) وەك ئۆرگانێکی بەرپرس، لەگرتنەبەری ڕێوشوێنە سیستەمەمیەکان، بۆ ئەو پرسانەی کەبەبریارێکی چارەسەری دەم و دەست نێردراون بۆ ئەوان :

ب) لەگرتنەبەری ڕێ و شوێنە سستمیەکان، بۆ ئەو پرسانەی کە بەبڕیارێکی چارەسەری دەم و دەست نەنێردراون بۆ ئەوان، بەڵام

پەیوەندیداران تێبینیان لەسەر بڕیاری کۆمیسیۆنی بنگەڕەك هەبێت، ئەوا وەك ئۆرگانێکی پێداچووەو بڕیار دەدات.

ج) وەك ئۆرگانێکی بەپرس بۆ چارەسەری کێشە پێرەویەکان، ئەوانەی لەدەرەوەی ڕێکخستنی گەڕەکەکان دێنەپێش.

د) وەك تاکە ئۆرگانێکی بەرپرس لەرێوشوێنەکانی بابەتەکانی بەتالکردنەوەی هەلبژاردن و ساغکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردن، کەلەناو سنوری گەرەکەکانی حزب دێنە پێش، یان پەیوەندییان بەکۆنفرانسەکانی گەرەکەکان یان هەرێمەکانی هەیە.

ه) وەك دزگایەکی بەرپرس لەرێوشوێنەکانی بابەتەکانی بەتاڵکردنەوەی هەڵبژاردن و ساغکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردن، ئەگەر بەرپرس پێشتر داوای پێداچوونەوەی کرد سەبارەت بەوەی پرسەکە گرینگایەتیەکی بنچینەیی هەبێت، یان بڕیاری پێداچوونەوە لەبەرژەوەندییەکانی ڕێکخستنی هەلبژاردندا بێت.

# باسی شەشەم

## ململانێیەکان و یەکلاکردنەوەیان

مرۆڤ لەماوەی ژیانی کۆمەڵایەتیداو بەپێی تواناکانی چەندین داب و نەریت و بەهاو چالاکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری دادەهێنێ.

لەماوەی ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیانە بازنەکانی ئینتمای مرۆڤ دیار دەبێت کەلەخێزان و کارو گەڕەك و خوێندنگاو حزبەوە دەس پێدەکات، ئەو بازنانە تێکەڵاوی یەکتر دەبن و دوورو نزیك دەکەنەوە لەسەرچەند مەرج و بنەمایەك کەمۆرکی شارستانی و کەلتوری کۆمەڵگە هەڵدەگرێت.

بەم بۆ چوونە مرۆڤ کاتێ جۆری پەیوەندییەکۆمەڵایەتیەکانی دەدۆزێتەوە ئاستەکانی ئینتمای دیاری دەکات ئەوا لایەنێکی تریشی بۆ ئاشکرا دەبێت ئەویش ڕێکخستنی پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکانە بەبازنەی ئینتماوە.

کاتێ پەیوەندییە لۆژیکیەکەی نێوان هزروکار (تیۆروپراکتیك) دەبێتە دیاردەیەکی سیاسی ئەوا پێویست دەکات لێکۆلینەوەی لەسەردا بکرێت.

لەناو هەر حزبێك چەندین ڕەوتی جیاواز هەیە کەلەگەڵ سروشتی حزبەکە تەبا دەبێت وەك ڕێکخستنێکی سیاسی، هەروەها حاڵەتێکی ئەقلانیەکە ئەو ڕەوتانە ململانێیان لەنێواندا دروست ببێت بەپێی شێوازێکی دیاریکراو سیستمی بنچینەیی حزبەکە، دیارە باری سەقامگیری و کارو باری ناوخۆی حزبەکە هۆکارێك دەبێت بۆ یەکلاکرنەوەی ئەو ململانێیە.

لەبارێکدا ئەگەر حزب پەکی کەوت لەبەدەست هێنانی ڕێگا چارەسەرێك بۆ ململانێیەکان ئەوا ئەو ململانێیانە دەتەقنەوە لەسەر جۆری جیابوونەوەو کۆتایی بەوە دێت کە ئەو ڕەوت و کۆمەڵانەی توانای گونجاندنیان لەگەڵ یەك نابێت لێك جیا دەبنەوە، ئەگەر چی ئەو جیا بوونەوەیەش بەزیان بۆ حزبەکە دەگەڕێتەوە.

لێرەدا چەند پرسیارێك خۆی دەسەپێنی و پێویستە وەڵام بدرێتەوەو کە پێویست بەلێکۆلینەوە کردنیش دەکات لەسەری.

ئایا دروستبوونی باڵی جیاجیاو سەر هەڵدانی ڕەوتی جیاوازی و ڕکابەرو دژ بەیەك لەناو ڕێکخراوو حزبە سیاسیەکان مەسەلەیێکی مێژوو کردە؟ یان دەشێ گەشەکردنی سیاسی بەدی بێ بێ ئەوەی کە گروپ و دەستەی دژ بەیەك بێتە ئاراوە؟

## ململانێ چیە؟

کرداری ململانێ یان بەر هەڵیستکردن بەرۆلێکی گرینگ هەڵدەسێت لەشیکردنەوەی نوێی ڕەفتاری ڕێکخراوەیی، ململانێ لەکێشە ڕەفتاریە سەرەکیەکانە بەرەو ڕووی بەرپرسی ڕێکخراوەکان دەبنەوە لەکارو باروژیانی ڕۆژانە، ململانێ کارێکە هیچ خۆ دەرباز کردنی لێ نیە دیاردەیەکی درێژخایەنە لەژیانی ڕێکخراوەیی. (٩٥)

هزری کۆمەڵایەتی لەسەدەی نۆزدەدا جەخت لەسەر ڕۆڵی ململانێی کۆمەڵایەتی دەکاتەوە لە بواری گەشە پێدان و رابوونی کۆمەڵگەو دامەزراوە سیاسیەکان.

بۆیە زاناو بیرمەندە کۆمەڵایەتیەکان لەسەردەمی فەیلەسوف (کونت) و بەرەو سەرەوە بابەخیان داوە بە توێژینەوەکان دەربارەی سیستم ویاسا

کۆمەڵایەتیەکان و بارودۆخە بابەتیەکان، ئەو لایەنانە لەتوانایاندا دەبێ تەواو کاری و هەماهەنگی کۆمەڵایەتی بۆ مرۆڤ بهێنەدی.

لێرەدا دوو بۆ چوون دەر دەکەوێت، کە هەر بۆ چوونێك سروشت و مەترسی ململانێی کۆمەڵایەتی راڤە دەکەن، هەر بۆ چوونێك پشت بەچەند ئەگەرێك دەبەستێت کەدژ بەوی تر بێت.

تیۆری هۆبز کەلەلایەن داروێنەو پشتگیری کراوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کۆمەڵگە لەباری ململانێ و جەنگی بەردەوامە.

تیۆری مارکس : باوەڕی وایە کە ناوەرۆکی ململانێ بریتیە لە ناکۆکی و دژایەتی نێوان بەرژەوەندی چینە کۆمەڵایەتیەکان، لەئاکامدا جۆری پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان کارەکە یەکلادەکاتەوە کەمرۆڤ پێکی دێنێت، لەگەڵ هۆیەکانی بەرهەم هێناندا.

هەموو ئەو بیرورا ناکۆکانە تائێشتا درێژەیان هەیە دەربارەی دیاردەی ململانێ لەناو سیستمە کۆمەڵایەتیەکان.

## چەمکی ململانێ : (٩٦)

ململانێ جۆرێکە لەکار لەیەککردنی کۆمەڵایەتی، تاك بەکاری دەهێنێ بەشێوەیەکی نهێنی یان ئاشکرا بەمەستی هێنانەدی ئامانجێکی دیاری کراو.

دەکرێت ململانێ بەکار بهێنرێت بۆ یارمەتی دان لەسەر دروست بوونی کەسایەتی تاك یان کەسایەتی ئۆرگان، هەروەها بەکار بهێنرێت بۆ لەکار خستنی داهێنانەکانی تاك و لەناوبردنی کەسایەتی و وێرانکردنی ئۆرگانەکە.

## پۆلین کردنی ململانێ : (٩٧)

پـۆلین کردنـی جۆرەکـانی ململانـێ شـێوازی جـۆراو جـۆری وەرگرتـووە بـەپێی دەروازەو تێروانینە هزرییە پەیوەندارەکان، گرینگترین ئەو جۆرانە بریتین لە :

١- ململانێی کەسایەتی :

ئەم جۆرە ململانێیە لەماوەی تێروانین یان مامەڵە کردنی هەر لایەنێك لەگەڵ لایەنەکەی تر بەدەردەکەوێت و بەپشت بەستن بەئاستێکی بەرزی هەست و سۆز کە ململانێیە راستیەکان لەژێر خۆیدا دەشارێتەوە.

٢- ململانێ دەربارەی ناسنامە:

ئەم جۆرە ململانێیە روو دەدات کاتێ لایەنێك هەسـت بـەوە دەکات کـە بەشـێکی بنچینەیی لەناسنامەکەی ریسوا یـان پـشت گـوێ خـراوە، ئـەم جـۆرە ململانێیانـە لەسـەر بنـچینەی جیاوازییـە ئەتنیـەکان یـان بیروباوەرەکـان یـا خـود ئاینیـەکان پێکدێت.

٣- ململانیە رێکخراوەییەکان .

ئەم ململانێیە لایەنە سیاسی و رێکخراوەییـەکان دەگرێتـەوە، کـە گـۆڕانی ئاسان نیـە، وەك ململانـێ دەربـارەی بـەکار هێنـانی دەسـەڵات و دەرامەتـەکان، شـێوازی رێکخستنەکان، مامەڵە کردن لەگەڵ یاساو سیستمە ئیدارییەکان ...هتد.

٤- ململانێ زانیارییەکان : (٩٨)

ئـەم ململانێیـە لـەنێوان حکومـەت و هاوڵاتیـان و کۆمپانیـاو رکابـەرەکان روو دەدات، نەگونجانی جۆری زانیاریـەکان و نـاکۆکی لەشـیکردنەوەکان لەگـەڵ پلـەی پەیوەندییـەکانیان بەیـەکترەوە، یـان شـێوازی کۆکردنـەوەیان لەهۆیـەکانی ئـەم جۆرە ململانێیانەیە.

٥- ململانێ ئایدیۆلۆژیاکان : (٩٩)

ئەم جۆرە ململانێیانە سەر هەڵدەدات بەهۆی هەوڵدانی هەر لایەنێك کەبەهاو بیروباوەڕو سیستەمەکانی خۆی بەسەر لایەنەکەی دی بسەپێنێ، ئەم جۆرە ململانێیە زۆر توند دەبێت، زاراوەکانی سپی و ڕەش و سڕینەوەی بەرامبەر دەبێت.

٦- ململانێ بەرژەوەندییەکان : دەربارەی بەرژەوەندی و پێداویستی و خواستە ناکۆکان دەبێت، ئەم جۆرە ململانێیانە زۆرترین جۆرن.

## شێوەکانی ململانێ

دەکرێت ئەو شێوانەی ململانێ لەخۆی دەگرێت بەم چەند خاڵە دەربخرێت:

١- ململانێ توندو تیژ :

خراپترین شێوەکانی ململانێیەکە لەئەنجامی پەککەوتنی هەر جۆرە هەوڵدانێك بۆ چاککردنەوەی بارو دۆخەکە ڕوودەدات.

٢- ململانێی شاراوە:

ئەم شێوە ململانێیە خۆی لەوە دەنوێنی کاتێ لایەنێك هەوڵدەدات بوونی ململانێیەکە بشارێتەوە یان نکوڵی لێ بکات..سەرەڕای ئاشکرابوونی دیاردەکانی لەماوەی پەیوەندی و مامەلەی نێوان لایەنەکان.

٣- ململانێی نوێبووە (دووبارە)

ئەم شێوەیەیان دووبارە سەر هەڵدەداتەوە یان شێوەو جۆری نوێ وەردەگرێت، هەر کاتێك نیشانەکانی چارەسەرییەك بەدەرکەوت .

٤- ململانێی ڕاستەوخۆ:
ئـەم شـێوە ململانێیـە سـنوری دیـاریکراوو زانـراوی هەیـە، هـەموو لایەنـە بەشـداربووەکانی توانـای رازی بوونیـان بـەڕێگا چارەسـەریەکان هەیـەو ڕەنگدانەوەی بەسەر پەیوەندییەکان دەبێت پاش کۆتایی هاتنی قەیرانەکە.

## گرینگترین ڕەفتارەکانی لایەنەکانی ناو ململانێ:

**١- ڕکابەری :**
ئـەم جـۆرە ڕەفتـارە لـەوە دەردەکـەوێت کـاتێ لایـەنێك جـەخت لەسـەر بەرژەوەندییـەکانی خـۆی دەکـات بەشـێوەیەکی ئاشـکراو جیاکـار، بـێ بایەخـدان بەبەرژەوەندی لایەنەکانی دی.

**٢- خۆگونجاندن :**
ئەم جۆرە ڕەفتارە لەوە دەردەکـەوێت کـاتی لایـەنێك لەبەرژەوەندییـەکانی خـۆی دوور دەکەوێتـەوە یـان تێپـەری دەکـات بـۆ ڕازیکردنـی لایـەنی بەرامبـەر وەك جۆرێك لە خۆ بوردەیی یان بێ باوەڕی یاخود خۆکێشانەوە.

**٣- خۆ دوور خستنەوە :**
ئەم جۆرە ڕەفتارە لـەوە دەردەکـەوێت کـاتێ لایـەنێك هەڵدێت لـە خـستنە ڕووی پێدایـستیەکانی، هـەروەها دوور دەکەوێتـەوە لەباسـکردنی پێداویـستیەکانی بەرامبەر .

**٤- ڕێککەوتن :**
ئەم ڕەفتارە دەردەکەوێت کاتێ لایەنەکان لەبارەی هەندێ بابەتی لاوەکی گفتوگۆ دەکەن بۆ گەیشتن بەڕێککەوتنێك وەك سەرەتایەك بـۆ گفتوگـۆ کـردن دەربـارەی بابەتە سەرەکیەکان.

**٥- هاوکاری :**

ئەم ڕەفتارە دەردەکەوێت کاتێ لایەنەکان کار بۆ ڕێککەتن و یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان دەکەن کەپەیوەندی بەبەرژەوەندی هەموو لایەنەکان هەیە بەشێوەیەکی پەسندکراو لە نێوانیان.

## هۆیەکانی ململانێ : (١٠٠)

١- جیاوازی لەئامانجەکانی نێوان گروپەکان لەناویەك ئۆرگانەدا، یان لەناو بەشەکانی.

٢- جیاوازی لەبەهاو ئاستی ڕۆشنبیری .

٣- گۆڕان لەدەسەلاتەکانی تاك یان گروپ، زۆری یان کەمکردنەوەی دەسەلاتەکان بۆتاك یان گروپ، دەکرێت هۆیەك بێت بۆ ململانێ.

٤- ئالۆزی لە شێوازی چالاکیەکانی کارکردن، کاتێ دوو ئەنجومەنی یان زیاتر بەشداری لەجێ بەجێکردنی کارێك دەکەن، ئەوتێکەلاوی و ئالۆزییە ململانێ دروست دەکات.

٥- دژایەتی و گۆڕان لەئەرك و ڕۆڵەکان، چەندی تاك یان کۆمەڵێك دوو ڕۆڵ یان زیاتری بەکار هێناو ئەورۆڵانەش دژ بەیەك بوون ئەوە دەبێتە هۆی ململانێ .

٦- گۆڕانکاری لەپلەو پایەو فەرمان.

٧- پێویستی بەشداریکردن لەسەچاوە دیاریکراوەکانی وەك : دەرامەتە جیاوازەکان، هێزەکانی کار، بواری دەسەلات..هتد.

دەکرێت هۆکارەکانی ململانێ دابەش بکرێتە سەر دوو تەوەر، هەروەك لەهەندێ لێکۆلینەوە بۆی دەچن، ئەو دوو تەوەرەش بریتین لە : هۆیە کەسایەتیەکان، هۆیە ڕێکخراوەییەکان. (١٠١)

١- هۆیە کەسایەتیەکان وەك :
هەست کردن بەرق و قین، خراپ درك پێکردن، ڕادەی پێڕەوی کردن و ڕاهاتن لەسەر کاری ڕێکخراوەیی، بارودۆخە تایبەتیەکان، پەیوەندییە نەگەتیڤیەکانی نێوان تاك و ئۆرگان، جیاوازی لەئاستی ڕۆشنبیری و بەهاکان.
٢- هۆیە ڕێکخراوەییەکان:
ڕکابەری لەسەر دەست کەوتەکان، ئاشکرا بوونی بەرپرسیاریەتیەکان، جیاوازی لەمامەڵە کردنی نێوان ئۆرگان و ئەنجومەنەکان، پەیوەندییەکانی نێوان ئۆرگانەکان، سەقامگیری باری ناوخۆیی ئۆرگان، ڕادەی گونجانی سیستم و بنەماکانی حزب لەگەڵ هەل و مەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسی.
بەپێی تایبەتمەندی وڵاتانی جیهانی سێیەم، هەندێ توێژەر هۆکارەکانی ململانێی ناوخۆی حزبە سیاسیەکان دەگەڕێننەوە بۆ : (١٠٢)

١) شێوازی کاری حزبی بەنهێنی لەچەند قۆناغێك، فاکتەرێکی گرینگە بۆ یەکگرتنی ناوخۆیی حزب، بەڵام کاتی حزب دەکەوێتە قۆناغی کاری ئاشکرا دیاردەکان ناکۆکی و ململانێ زیاتر دەردەکەوێت.
٢) لاوازی یان بزربوونی ڕێبازی دیموکراسیەت لەژیانی ناوخۆی حزبە سیاسیەکان، هەروەها بەشداری نەکردنی توێژێکی فراوانی ئەندامان لەدارشتنی بەرنامەو پرۆسەی هەلبژاردنی سەرکردەکان.
٣) کارپێکردنی جۆرە دەسەڵاتێك بۆ سیاسەتێکی دوولایەنە کە تارادەیەکی گەورە ناکۆك و دژ بەیەکن، لەبواری ڕاگەیاندن و وتاری سیاسی ئاشکرا باوەڕ هێنان بەدیموکراسیەت و فرە حزبی و سیاسی و کارپێکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات، بەڵام لەهەمان کاتدا لەڕووی پراکتیکەوە هیچ ڕەفتارێکی دیموکراسیانەی تێدا بەدی ناکرێ، بەڵکو شێوازێکی جیاواز دەبێت کە بریتیە لە تۆقاندن و بەخشین.

بەکورتی دەکرێت هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆی حزبەسیاسیەکان بۆ ئەم خاڵانە بگەڕێنێتەوە :

١. **جیاوازی تەمەن و ئەزموون.**
٢. **جیاوازی لەڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیەوە.**
٣. **جیاوازی لەئایین و مەزهەب.**
٤. **جیاوازی لەئاستی رۆشنبیری و هزرییەوە.**
٥. **جیاوازی لەبەرژەوەندییەکان.**

## بەڕێوەبردنی ململانێی رێکخراوەیی : (١٠٣)

بەڕێوە بردنی ململانێ لەناو رێکخراوە سیاسیەکاندا، لەم چەند ساڵەی دوواییدا گۆران بەسەر شێوازو بەڕێوەبردنیدا هاتووە، هۆکاری ئەم گۆڕانکارییەش بۆ ئەو پەرەپێدانە دەگەڕێتەوە کەپەیوەستە بەو گۆڕان و پەرەپێدانانەی لەبواری تیۆرەکانی رێکخستنەوە روویداوە لەلایەکەوە لەگەڵ زۆر بوونی توێژینەوە مەیدانیەکانی لەبواری کارگێری و زانستەکانی کۆمەڵایەتی و دەروونناسی.

دەبێ ئەو راستیەش بزانین کەململانێ کارتێکردنی ئاشکرای هەیە لەسەر ئاستی ئەرك بەجێگەیاندنی حزب و رێکخراوی سیاسی.

لێکۆلینەوەو هەوڵە تایبەتیەکان بەردەوامن لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی لە لایەن کەسانی پسپۆرانی لەم بوارەدا.

ئەمەی خوارەوە پوختەییکە بۆ ئەو ستراتیژییەتانەی خراونەتە روو لەلایەن پسپۆرانی تایبەت بەشێوازەکانی بەڕێوەبردنی ململانێی رێکخراوەیی.

## ستراتیژییەتی بەڕێوەبردنی ململانێی ڕێکخراوەیی

| | مارج و سیمون ١٩٥٨ | لیتدر ١٩٦٥ | کانز، کان ١٩٦٦ | هودج، ئەنتوی ١٩٧٩ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بەکارهێنانی شێوازی زانستیانە بۆ چارەسەرکردنی ململانێ | بەکار هێنانی بەربەست لە نێوان لایەنە دژەکان | چاککردنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامانی ئۆرگان بەشێوازێکی داهێنانە | بەکار هێنانی هێز بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێکە |
| ٢ | ڕازی کردن | یارمەتیدانی تاکەکان بۆ زاڵبوون بەسەر ململانێی ناوخۆیی یان دەرەکی لەڕێگای تێگەیشتنی خودی و چۆنیەتی کارتێکردن لەکەسانی تر. | دۆزینەوەی لایەنێکی کارگێری بەرپرس بۆ چارەسەرکردنی ململانێکەو بەڕێوەبردنی کاروبار. | خاوکردنەوەو هێمن کردنەوەی ململانێکە. |

| ٣ | گفتوگۆکردن | ڕاستکردنەوەی پەیکەری ڕێکخراوەیی ئۆرگان | دووبارە دارشتنەوەی پەیکەری ڕێکخراوەیی ئۆرگانەکە | ڕێککەوتن لەنێوان لایەنە دژەکان. |
|---|---|---|---|---|
| ٤ | سیاسەت و هەوڵی بەهێز کردنی لایەنی لاواز | | | ڕووبەڕوو بوونەوە |

## چەند تێڕوانینێك لەپێناو دۆزینەوەی چارەسەریەك بۆ ململانێی ناو خۆی حزبە سیاسیەکان:

پێویست دەکات کادیرو ئۆرگانەکانی حزبی تێگەیشتنی تەواوو ڕاستیان بۆ بارو دۆخی کۆمەڵگە هەبێت چ لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە دەبێت یان سیاسی، لەبەر ئەوەی بنچینەی بنیاتی ڕێکخراوەیی ڕێکخستنەکە لەو پێکهاتەیە.

ئەم تێگەیشتنە لەنەخشەی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناوکۆمەڵگە یارمەتیدەر دەبێت بۆ دیاریکردنی هۆیەکانی ململانێ و دوورە بەرەکیەکە.

سەرەڕای ئەو ڕاستیانە ڕۆڵی سەرکردایەتی حزب دەربارەی کردارەکانی ململانێ و ناکۆکی زۆر گرینگ و بەهەند وەردەگیرێت لەبەڕێوەبردنی ئاراستەی ململانێیەکە.

١) دیاریکردنی خودی ململانێیەکە : (١٠٤)

دیاری کردنی ئاست و بوارو ڕادەی ململانێ و ئەو لایەنانەی پەیوەندی ڕاستەو خۆی یان ناڕاستەو خۆیان هەیە بەململانێکەوە، زانینی فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی و فراوانبوونی.

٢) ئامانج لەچارەسەرکردنی ململانێیەکە:

لەڕاستیدا ئامانجی چارەسەری ململانێیەکان بریتیە لەهاوسەنگیەکی بەرجەستە بووی نێوان ئامانجی گروپ و لایەنەکانی ململانێ، واتە دۆزینەوەی هێلێکی هاوبەش و ناوەند لە نێوان ئەو لایەنانەی ململانێکانیان دروست کردووە.

٣) ڕێگرتن لە کەڵەکەبوونی ململانێ و قوڵبوونەوەی.

٤) دیاری کردنی ئەلتەرناتیفی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.

بەپێی بۆ چوونی چەند شارەزاییەکی ئەم دیاردەیە، ململانێ دوو جۆر ئاسەواری دەبێت:

دروست کەر (پۆزەتیف) و لایەنی ڕوخێنەر (نەگەتیف) بەم جۆرەی خوارەوە : (١٠٥)

أ) لایەنە پۆزەتیڤەکانی :

١) ململانێ دەبێتە هۆی پەیدابوونی وزەیەك لەناو ئەندامانی ڕێکخستن کەهەستە وروژێنەرەکان دروست دەکات.

٢) ململانێ دەبێتە هۆی پەیدابوونی لایەنگیری و هەست بەیەکبوون لەنێوان ئەندامانی یەك گروپ.

٣) ململانێ ڕادەی یەکگرتوویی و هێز لەنێوان ئەندامانی یەك گروپ زیاد دەکات و دەبێتە هۆی هاندان بۆ جێ بەجێکردنی ئەرکەکان.

٤) ململانێ نیشانەیە لەسەر بوونی کێشە، کەدەبێتە هۆی بایەخ پێدانی زیاتر بۆ دۆزینەوەی چارەسەری بەپەلە.

ب) ئاسەوارە نەگەتیڤەکانی :

١) کەم کردنەوەی هەست بە ئازادی زیادە ڕۆیی لەداواکانی ملکەچی و پاشکۆیەتی و پابەند بوون بەبڕیارەکان.

٢) پەکخستن تواناکان و ڕێگرتن لەبەردەم بەکار هێنانیان.

٣) دەبێتە هۆی کوشتنی گیانی بەکۆمەڵ و لاوازکردنی ویستی هاوکاریکردن لەماوەی دورودرێژ .

٤) ململانێ بە (خۆراکی گەڕاوە) دەناسرێت، چەندی ململانێیەکە توند بێت دەبێتە هۆی تێکشکانی پەیوەندییەکان.

## چەند نموونەیەك لەململانێی ناو خۆی حزبەکان:

**یەکەم** // حزبی بەعسی عەرەبی سوسیالست : (١٠٦)

سەرەتاکانی پێکهێنانی لەسەر شێوەی بزووتنەوەیەکی خوێندکاران بوو بەسەرکردایەتی (میشیل عفلق و صلاح البیطار) کۆنگرەی دامەزرێنەری لەشاری دیمەشق بەست لەمێژووی ٧/نیسانی/١٩٤٧.

ساڵی، ١٩٥٢ لەگەڵ حزبی عەرەبی سوسیالست بەسەرکردایەتی (اکرم الحورانی) یەکیان گرت، لەساڵانی شەستەکان ناکۆکی وململانێ لەناو ئەم حزبە سەری هەڵدا بەهۆی هەڵوێست لەیەکێتی عەرەب وسیاسەتی گشتی حزب، ئەوی زیاتر بووە هۆی توند بوونی ململانێ و ناکۆکیە ناوخۆییەکان، وەرگرتنی هەڵوێست بوو لە یەکێتی نێوان هەردوو وڵاتی سوریاو میسر و جیابوونەوەی ساڵی ١٩٦١بوو.

ئەم حزبە ساڵی ١٩٦٣ لەهەر دوو وڵاتی سوریاو عێراق گەیشتە دەسەڵات، پاشان زنجیرەیەك ململانێ و لێك جودا بوونەوە ڕوویدا لەناو ریزەکانی، سەرکردایەتی

و کادیرو ئەندامانی دەستە دەستە دابەش بوون و حزب و ڕێکخراوی تریان لێ پێکهات.

ئەو خەسڵەت و ئاکارانەی تایبەتن بەجیابوونەوەو ناکۆکیەکانی ناو خۆی حزبی بەعسی بەستراوەتەوە بەچەندین ڕووداوی نیشتمانی و نەتەوایەتی کە هۆو دەرئەنجامی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی عەرەبیدا هەبووە، هەموو ئەوانە کارتێکردنی لەسەر باری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئاراستەی سیاسی بەعس هەبووە.

### جیابوونەوەی اکرم الحورانی :

اکرم الحورانی دامەزرێنەری حزبی بەعسی سوسیالست بوو لەپێش یەکگرتنیان لەگەڵ حزبی بەعس و پاشان بووەتەوە یەك لەجەمسەکانی حزبە نوێیەکە.

لەگەڵ دروستبوونی یەکێتی نێوان سوریاو میسر ساڵی ١٩٥٨، اکرم الحورانی بووە بەجێگیری سەرۆك کۆمار لەحکومەتی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بەسەر کردایەتی جمال عبدالناصر.

پاش چەند مانگێك ناکۆکی و ململانێیەکان کەوتە نێوان اکرم الحورانی و جمال عبدالناصر بەچەند شێوەیەك بەهۆی شێوازی بەڕێوەبردنی حوکمڕانی لەسوریا، هەروەها ئەو ئاستە ڕێکخراوەییە سیاسیەی کەبڕیار بوو ڕێکخراوی (یەکێتی نەتەوایەتی عەرەبی) بەدەستیەوە بگرێ لەماوەی ئەزموونی یەکگرتنەکەدا وەك خواستێکی بەعس بەوەی کە ئەو یەکێتیە نوێیە ببێتە ڕێکخستنێکی سیاسی بۆ بەعس و بۆ جمال عبدالناصر .

سەرەڕای ناکۆکیەکان دەربارەی کێشەی چاککردنی کشتوکاڵ و مولکیەتی زەوی وزار...هتد.

ڕۆژانە ئەو ناکۆکیانە گەورەترو ئاڵۆزتر دەبوون بەخێرایی، تاکارەکە گەیشتە ئەوەی (اکرم الحورانی) و دەستەیەك لەوەزیرەکان وازهێنانی خۆیان ڕابگەیێنن.

جمال عبدالناصر ئەو هەنگاوەی بەدژایەتیەك بەرامبەر بەخۆی و بەدەسەڵاتەکەی دانا، هەروەها بەخۆدزینەوەی بەعس، بەرامبەر بەرپرسیاریەتی لەئاست ئەو یەکێتیە.

ئەو هەنگاوەی (اکرم الحورانی) دەرگای هێرش کردنی ڕاگەیاندنی خستە سەرپشت، کە دەست پێشکەرییەکە لەلایەن جمال عبدالناصر و هۆیەکانی ڕاگەیاندنی حکومەتەکەیەوە بوو، لە هەمان کاتدا لایەنی (اکرم الحورانی) بە هەڵمەتێك وەڵامیان دایەوە، بەڵام دام و دەزگاکانی حزبی بەعس هەموویان لەیەك ئاست نەبوو، هەندێکیان لایەنگیری جیابوونەوەیان دەکرد لەهەست و بیری بەشێك لەکادیرو سەرکردەکان چەسپی ببوو، هاوشان ئەو خۆسازدانە سیاسیەی نێوان عبدالناصر و بەعس هەڵمەتێکی گرتن دەستی پێکرد لەلایەن دەزگاکانی ئاسایش حکومەت دژ بەکادیرە مەدەنی و سەربازیەکانی ڕەوتی جیابوونەوەکە.

بەهۆی ئەوبارو دۆخە (اکرم الحورانی) بەهاوکاری (صلاح البیطار) بەڵگەنامەی جیابوونەوەی بەفەرمی واژوکرد، وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر جمال عبدالناصر و هەڵمەتەکانی دەسەڵات، باڵێکی تری بەعس بەسەرکردایەتی (میشیل عفلق) لەدەست پێشکەرییەك هێرشی کردە سەر ڕەوتی جیابونەوەکەو تاوانبارکردنی سەرکردەکانی، هەروەها لەبڵاوکراوەکانیان داوای دوورخستنەوەی بەرەی جیابوونەوەیان کرد لەگەڵ گەڕانەوەی یەکێتی عەرەبی لەسەر بنەمای نوێ.

پاش ماوەیەکی کورت لەم ململانێیانە (صلاح البیطار) یەك لەسەر کردەکانی جیابوونەوە، ڕەخنەی لەهەڵوێستی خۆی گرت و پەشیمان بووەوە لەپشتگیریکردنی جیابوونەوەکە.

بەڵام (اکرم الحورانی) لەسەر هەڵوێستی خۆی بەردەوام بوو، بۆیە سەرکردایەتی حزبی بەعس بڕیاری دەرکردنی (اکرم الحورانی)نیان لەگەڵ دەستەکەی دا ساڵی ١٩٦٢، هەرچی هەوڵێکیش درا بۆ پەشیمان بوونەوەی سەری نەگرت.
لەهەمان کاتدا (اکرم الحوران) بڕیاری پێکهێنانەوەی حزبەکەی خۆی (حزبی عەرەبی سوسیالستی)دا بەدوور لەبەعسیەکن و دژیانیش .

**دووەم** //ململانێیەکانی ناو (حزبی میسری لاو) (١٠٧)
لەبەرواری ١٢/ ١٠/١٩٨٧ دادگای یاسایی ڕەزامەندی لەسەر دامەزراندنی ئەم حزبە دەرکرد، لەکاتێکدا کە کۆمیتەکانی ئەم حزبە پاش (٣) ساڵ لەدووای ئەوە پێکهاتن.
ئەم حزبە هەروەکو دامەزرێنەرانی سەرەکی دەڵێن، درێژە پێدانی ڕێبازی (حزبی میسری لاو) ی ساڵی (١٩٣٠) بووەکە دامەزرێنەکەی (احمد حسین) بوو.

## ململانێ و جیابوونەوەکانی ناو ئەم حزبە :

ئەم حزبە وەك گەلێك لەحزبە ئۆپۆزسیۆنەکانی تری میسر چەند جارێك ململانێ و جیابوونەوەو کەرت بوونی بە خۆیەوە دیوە.
١- یەکەم جیابوونەوە بەسەرکردایەتی (سامی مبارك)ی برای (حسنی مبارك) سەرکۆماری ئێستای میسر ئەنجام دراوە، دووای ڕاگەیاندنی ئەو جیابوونەوەیە ئەو حزبە هەرەسی هێنا.
لەسەرەتای مانگی شوباتی (١٩٩٢)دا ( حسام الدین کامل) بە هاوکاری ژمارەیەك لەلایەنگرانی خۆی و کەڵك وەرگرتن لەهێزی دەسەلات، بۆ ماوەی (٦) سەعات ناوەندی حزبیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆ یانەوە.

هەروەها دەرکردنی (علی الدین صالح) و ئەندامانی شورای حزبیان راگەیاند، ئەوەشیان راگەیاند کەکاتی دامەزراندنی حزبێکی تازە هاتووە، لەکۆبونەوەی گشتی سالانەی حزبدا هەلبژاردنی (علی الدین صالح) یان بەساختەکاری هەژماردو ئەوەشیان بلاوکردەوە کە (صالح) سیاسەتی حزبی لەبەرامبەر حکومەتدا گۆڕیوە.

٢- لەرۆژی (٨/مایس/١٩٩٢) دا کۆنگرەی حزب لەشاری (اسکندریە) بەئامادە بوونی (١٥٠٠) ئەندام بەسترا، رای ئەندامانی کۆنگرە وابوو کە (صالح) ی سەرۆکی حزب لابدرێ و لەشوێنی ئەو (عبدالله رشدی) بکرێت بەسەرۆك، کۆنگرە ئەم رایەی بەسەر هەموو لیژنەکانی حزبدا بلاوکردەوە، هەروەها کۆمیتەی حزبەکان لەبەرورای (٢٣/٥/١٩٩٢) بەبلاوکراوەیەك پشتگیری ئەم بڕیارەیان کرد.

(علی الدین صالح) سەرەڕای ئەوەی کە ئەم بڕیارانەی پەسند نەکرد سەبارەت بەدەست تێوەردانی کۆمیتەکان لەدادگای ئیداری سکالایەکی پێشکەش کردوو بانکەکانی ئاگادارکردەوە کەحسابی حزب رابگرن تائەنجامی دادگایی یەکلادەکرێتەوە.

ئەم رووداوە گۆڕانکارییەکی نوێی لەهەڵس و کەوتی دەسەلاتدابەرامبەر بەحزبە سیاسیەکان دیاریکرد، تا ئەم کاتە کۆمیتەی حزبەکان بەکارو باری ناو خۆی حزبەکاندا خۆی هەلنە قورتاندبوو، ئەم هەنگاوە نارەزایی هەموو حزبە سیاسیەکانی لێ کەوتەوە .

کۆمەڵی (الاخوان المسلمین) و (ابراهیم شکری سەرۆکی حزبی کار) و (مصطفی کامل مراد) سەرۆکی حزبی الاحرار، (فؤاد سراج الدین) سەرۆکی حزبی الوفد، لەبەیاننامەیەکدا سەرۆکایەتی ( علی الدین صالح) یان سەلماندوو دەستێوەردانی کۆمیتەی حزبەکانیان تاوانبارکرد.

**سێیەم** //ململانێیەکانی ساڵی ١٩٦٤ی پارتی دیموکراتی کوردستان

پارتی دیموکراتی کوردستان لەمێژووی ١٩٤٦/٨/١٦ دامەزرا بەسەرۆکایەتی (مصطفی بارزانی) سەرۆکی حزب تا هەلگیرساندنی شۆرشی ١٤ تمووزی ١٩٥٨ وەك پەنا هەندەیەکی سیاسی لە وڵاتی (یەکێتی سۆڤیەت) مایەوە.

پاش شۆڕشی ١٤ تمووز، ئەم حزبە بەئاشکرا ڕێگای پێدرا چالاکیەکانی ئەنجام بدات، ساڵی ١٩٦١ بەهۆی تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان پارتی و حکومەتی عبدالکریم قاسم شۆڕشی چەکداری لەکوردستان هەلگیرسا، تاساڵی١٩٧٥ کە ئەم شۆڕشە تووشی تێشکانێکی سەربازی گەورە هات، لەو ماوە دوورو درێژەدا گفتوگۆو ڕێککەوتن لەنێوان حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق وسەرکردایەتی پارتی ئەنجامدراوە.

لەمێژووی ١٩٦٤/٢/١٠ ڕێککەوتنێك لەنێوان حکومەتی بغداد بەسەرۆکایەتی (عبدالسلام عارف) و سەرکردەی پارتی (مەلا مستەفا بارزانی) بەسترا، ئەم ڕێککەوتنە بوو بەهۆی پەیدابوونی ناکۆکی وململانێ لەنێوان (مەکتەبی سیاسی) پارتی لەلایەك، لەگەڵ سەرۆکی پارتی لەلایەکی ترەوە، سەر ئەنجام ئەو حزبە تووشی کەرتبوون هات و بەمەش بزووتنەوەی چەکداری وسیاسی لەکوردستانی باشور تووشی گرفتێکی ترسناك هات وشەڕی براکوژی لێ دروست بوو.

(١٠٨) پەیوەندییەکانی نێوان پارتی بەرەو بەرزبوون چوو، ڕەخنەو نارەزاییەکانی (م.س) زۆر بوو، بۆیە ئەم باڵە لەمانگی نیسانی ساڵی ١٩٦٤ کۆنفرانسێکیان بەست لەشارۆچکەی (ماوەت)، دەکرێت ئەم کۆنفرانسە بەیەکەم بزماری دووبەرەکی دابنرێت کەلەتابووتی ژیانی پارتایەتی چەقێندرا لەکوردستان، ئەم کۆنفرانسە (٦) ڕۆژی خایاند، وەفدێکی حزبی کەبریتی بوو لە (٦) ئەندامی (مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی) نێردراوی کۆنفراس،

چوونە لای مەلامستەفا لەشارۆچکەی (سەنگەسەر) و دوای ئەوەی نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك گەڕانەوە.

مەلا مەستەفا سوور بوو لەسەر ئەوەی کە (ابراهیم احمد) لەسکرتێری پارتی لابدرێ و لە جێگای ئەو (جلال تالەبانی) دابنرێ، ئەم هەڵوێستەی بارزانی وای لە کۆنفرانس کرد هەڵوێستی توند وەربگرن لەبەرامبەر بارزانی.

ڕەخنەو نارەزاییەکانی باڵی (مەکتەبی سیاسی) لەئاست ڕێککەوتنەکەی بارزانی لەگەڵ حکومەتی عبدالسلام عارف لەسێ تەوەری سەرەکیدا بوو، هەروەك لەبەیاننامەکەی ١٩٦٤/٤/١٩ دەردەکەوێت و بریتیە لە : (١٠٩)

١- شێوازو ڕێوشوێنی ئەنجامدان و مۆرکردنی ڕێککەوتنەکە.

٢- ناوەرۆکی خاڵەکانی ڕێککەوتنەکە و کاریگەرییان لەسەر چارەنووسی گەلی کورد.

٣- ناکۆکی لەسەر جێ بەجێکردنی ڕێککەوتنەکە .

لەبەرامبەردا بارزانی هۆکارەکەی مۆرکردنی ڕێککەوتنامەکەی بۆ دووخاڵ گێڕایەوە :

**أ ) گەلی کورد تاقەت و توانای شۆڕشی نەماوە.**

**ب ) حکومەتیش تواناو تاقەتی نەماوە**

بەبۆ چوونی توێژەران هۆکارەکانی ڕوودانی ئەو ململانێ و لێکترازانە بریتین لەم خاڵانە:

١- جیاوازی لەڕووی کەلتورو پەروەردەی کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژییەوە.

٢- جیاوازی لەتێگەیشتنیان لەئاست ژیانی حزبایەتی و ڕۆڵی حزب لەبزووتنەوەی نەتەوەیی گەلی کورد.

٣- جیاوازی لەدیدو بۆ چوونەکانیاندا دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ سیاسەتەکان حکومەتی عێراق بەرامبەر بەگەلی کورد و شێوازی هەڵسوڕاندنی سەرکرایەتی کورد بۆ کاروباری بزووتنەوەکەی بەگشتی و پرۆسەکانی دانوستانکردن لەگەڵ حکومەتدا .

٤- ململانێ لەپێناو سەرکردایەتی و دەسەڵات.

٥- رۆڵ و دەست تێوەردانی حکومەتەکانی دراوسێ بەتایبەتی ئێران و تورکیا و سوریا لەکاروباری ناوخۆی بزووتنەوەی کورد.

## گرینگترین وێستگەکانی پەیوەندی نێوان دووباڵەکەی پارتی بەم شێوەیە بوو:

١- لەمێژووی ١٩٦٤/٣/١٧ دا وتووێژی چڕو پڕ لەنێوان (مستەفا بارزانی و ابراهیم احمدو عزیز شەمزینی و عمر مستەفا) روویدا، لەئاکامدا پێکهاتن لەسەر قایل بوون بەو رێککەوتنە، بەڵام بارزانی هەر بەچاوی گومانەوە دیروانیە (ابراهیم احمد)، بۆیە بارزانی بڕیاریدا بەلابردنی ژمارەیەك لەفەرماندەکانی پێشمەرگە کەلایەنگیری باڵی (مەکتەبی سیاسی) بوون، لەبەرامبەریشدا (ابراهیم احمد) کۆنفرانسی ماوەتی بەست و تێیدا بڕیار لەسەر هەڵپەساردنی سەرۆکایەتیەکەی بارزانی بۆ پارتی درا.

٢- لەبەرامبەردا بارزانی کۆنگرەیەکی بەناوی کۆنگرەی شەشەمی پارتی بەست لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٦٤ لەو کۆنگرەیەدا ژمارەیەکی زۆری بڕیاردرا لەناو ئەو بڕیارانەدا : (١١٠)

بڕیاری ژمارە (١٣) کە بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

بڕیاردرا بەدەرکردنی (١٤) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆنی پارتی لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە :

"دروست کردنی دووبەرەکی لەناو لەشکر، هەڵسان بەکرداری زیان بەخشی، نانەوەی ئاژاوە لەناوچە ڕزگارکراوەکان، هێرشی ڕاگەیاندن"

بەگشتی لێکترازان ڕوویداو کاریگەری لەسەر بارودۆخی گشتی لەکوردستاندا بەجێهێشت و تاساڵی (١٩٧٠) ململانێی سیاسی و چەکداری لەنێوان هەردوو باڵەکە درێژەی کێشا، بەسەدان قوربانی لێکەوتەوە، ئۆرگانەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان هەڵوەشانەوەو دابەش بوون بەسەر هەردوو باڵەکە.

# باسی حەوتەم

## پەیکەری نیزامی و پەیکەری نانیزامی

### ڕێکخستن و سیستم : (111)

سیستم بریتیە لە کۆمەڵە توخمێك یان ئەو بەشانەی کە لەڕووی وەزیفەوە لە نێوان خۆیاندا بەشێوەیەکی ڕێك و پێك و پەیوەست دەبن بەیەکترەوە، ئەویش بەو کارلێکردنەو پشت بەیەکتر بەستنە ئاڵ و گۆڕەی نێوانیان.

ڕێکخستنی فەرمیش بریتیە لە سیستمێکی چالاکیە ڕێك و پێکەکان بەپێی خواستی کۆمەڵە کەسانێك.

هەموو ڕێکخراوێکی سیاسی کەلەچوار چێوەی سیستمێك کاربکات ئەم ڕاستیانە دەگرێتە خۆی :

١- لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە، بوونی کۆمەڵە کەسانێك کەبەشێوەیەکی بەردەوام کاردەکەن.

٢- ئامانج لەدروستکردنی ڕێکخراوەکە، هەر ئەندامێك چەند ئامانجێکی هەیە، ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە گوزارشت لەئامانجی ئەندامانی دەکات.

٣- پێکهاتەی ڕێکخراوەکە، لەچەند بەشێك پیکدێت و هەر بەش و یەکەیەك لەناو ڕێکخراوەکە ئەرك و ڕۆڵی خۆی هەیە لەجێ بەجێکردنی ئامانجەکان.

٤- چۆنیەتی بەکارخستنی ئەندامان لەناو ڕێکخراوەکە، لەنێوان ئەو کۆمەڵە ئەندامە کارلێکردنی بەردەوامی ڕێك و پێك دەبێ.

٥- سنوری كاریگەری ڕێكخراوەكە، یان ئەو ژینگەیەی ڕێكخراو لەچوارچێوەیدا هەوڵی جێ بەجێكردنی ئامانجەكانی دەدات.

٦- گۆڕانكاری ڕێكخراوەیی هەموو ڕێكخراوەكان دووچاری گۆڕانكاری دەبن، بەپێی هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە.

## خەسڵەت و ئاكارەكانی ڕێكخراوی نیزامی كارا:

١- دەسەڵاتەكان پلە بەپلە دەبێت.

٢- بوونی بنەماو ڕێنماییەكانی كاركردن.

٣- پەیوەندییەكان فەرمی دەبن.

٤- ئەرك و فەرمانەكان دابەش دەكرێن.

٥- هەندێ لەكادیرو ئەندامانی شارەزاو كارمە دەبن.

٦- دەست نیشانكردنی ئامانجەكانی ڕێكخرا.

٧- زانیاریەكان لەهەموو لایەكەوە كۆدەبنەوە بەهاوكاری ئەندامان. (١١٢)

٨- ململانێ لەناو ئۆرگانەكان بەكارێكی سروشتی دادەنرێت و بەسوود دەبێت ئەگەر لەسەر بابەتەكان بێت نەك كاروباری كەسایەتی.

٩- بارودۆخی گشتی، كراوەو ئاشكرا د ەبێت بێ ركابەری.

١٠- بڕیارەكان، بەزۆرینەی دەنگ دەبێت، هەموو لایەك پابەندی دەبن، هەموو دەرامەتەكان بەكار دەهێنرێت لەلێهاتووییەوە.

١١- داهێنان، چەندین ئەگەر لەبەردەم ئەندامان دەبێت بۆ داهێنان، چەند ڕێگا چارەیەك دەخرێتە ڕوو بۆ كێشەكان.

١٢- ناوەندێتی دەسەڵات، دابەش دەبێت لەنێوان هەموو لایەك بەپێی پلەی ئۆرگانی و بەرپرسیاریەتی ئەندامان.

١٣- هاندان، پابەند بوون بەئامانجەکانی رێکخراوو هێنانەدی پێداویستیەکانی کۆمەڵ.
١٤- پاداشت و لێپرسینەوە، دەرفەت پێدانی زیاتر بۆ گەشەکردن بەبەشداریکردنی هەموولایەك، رێزگرتن لەبیروڕای هەڤاڵان، بەدوواداچوون بۆ کاروبارو چالاکیەکان.

## رێککخستنی نانیزامی : (١١٣)

رێکخستن لەشێوازی نانیزامی بریتیە لەچەند گروپ و دەستەیەك کەشێویەکی رێکخراوەیی دیاریکراویان نیە، هەروەها خەسلەتێکی فەرمی سنوردری نیە.
سەرەڕای نەبوونی لق و بەشی جۆراو جۆر، بەو واتایەی کەکۆمەڵە سروشتکارییەکی تاکەکانە لەبواری کارکردن .
هۆیەکانی دروست بوونی رێکخستنە نانیزامیەکان دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك لەم هۆیانەی خوارەوە یان هەموویان بەسەر یەکەوە:
١-پەیوەندییەکانی شوێنی کار و لێکنزیکی جوگرافی.
٢- پابەبوونی ئایدیۆلۆژی و ئاستی رۆشنبیری نزیك.
٣- لێکچوونی رەوشی چینایەتی.
٤- بەرژەوەندییەکانی تاك .
٥- خزمایەتی و هاورێیەتی.

## گروپ (دەستە) چیە :

گروپ لەکۆمەڵە بوونی تاکەکان پێکهاتووە، لەنێوان خۆیاندا بەرەو چەند ئەنجامێکی سیاسی هاوبەشی کار لەیەك دەکەن.

گروپەکان کاریگەریان لەسەر ئاراستەو ڕەفتاری ئەندامەکانیان هەیە لێکۆڵینەوەکانی بواری گەشەپێدانی سیاسی دەریان خستوە کە گروپە چاوکییەکان کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر ئەندامەکانیان هەیە.
گروپەکانی بەرژەوەندی لەبەکارهێنانی چالاکیەکانیاندا چەندین تەکنیك بەکار دەهێنن وەك دانوساندنی نهێنی و پروپاگەندە وپشتیوانی هەلبژاردن و دروستکردنی پەیوەندی تایبەت.

## جۆرەکانی گروپ: (١١٤)

لەناو ئەدەبیاتی گروپدا چەندین هەوڵ هەیە بۆ پۆلین کردنیان، (دیڤید ترومان) چوار جۆر گروپی دیاریکردووە:

١- گروپی دەستەیی :

ئەندامانی ئەو گروپە لەسیفەتێکی دیاریکراودا هاوبەشن، ئەگەر ئەو سیفەتە دیموگرافی بێت یان سروشتی، پلەو پایەدار بێت، ئابوردار بێ، (کۆمەلایەتی – بازرگانی) بێت.

٢- گروپی کارلێکردن :

ئەندامانی ئەم گروپە ئەگەر چی لەسیفەتێکی دیاریکراویشدا هاوبەشن و ئەو سیفەتە پاڵیان پێوە دەنێت بۆ کۆبوونەوەو پێکەوە بوون، بەلام ڕێکخستنێکی فەرمیان نیە.

٣- گروپی دامەزراوەیی :

ئەم گروپە ڕێکخستنێکی دان پێدانراوی فەرمی هەیە.

٤- گروپی شاراوە (Potentional)
لەم گروپەدا دەشێت چەند تاکێك بەپێی سیفەتە هاوبەشەکانی نێوانیان لەساتێك لەساتەکاندا کار لەیەك بکەن و خۆیان ڕێکبخەن و دەربکەون.

## ئاکارو خەسڵەتەکانی ڕێکخستنی نانیزامی : (١١٥)

١- گروپ و دەستە گەرییە نانیزامییەکان خاوەن پێوەری دیاریکراوو داب و نەریتی تایبەتن، ڕەنگە جیاواز بن لەگەڵ بەهاو پێوەرە ئۆرگانیە نیزامییەکان. بۆیە دەبینین ئەندامی ڕێکخستنی گروپە نانیزمییەکان بەزۆری تووشی ململانێ دەبێت لەنێوان بەهاکانی گروپ و بەهاکانی ئۆرگانە نیزامیەکان.
٢- ئەو هۆکارانەی بەکار دەهێنرێن بۆ لێکۆلینەوە لەگروپەنانیزامیەکان جیاواز دەبن لەوانی بەکار دەهێنرێن لەلێکۆلینەوەی ڕێکخستنی نیزامی، لەم بوارەدا گروپە نانیزامیەکان پشت بەشێوازی لێکۆلینەوەی پەیوەندییە کۆمەلآیەتیەکانی تاك دەبەستێت لەناو گروپێکی دیاریکراودا.
٣- ڕێکخستنی نانیزامی بەپێچەوانەی ڕێکخستنی نیزامی، پەیوەندییە تایبەتیە کۆمەلآیەتیەکانی نێوان ئەندامانی گروپ بەهەند وەردەگرێت و جەختی لەسەر دەکات، بەرەچاوکردنی ئەوەی کەکێشە پەیوەندارەکان بەئەندامان دەکرێت چارە سەربکرێت لەرێگاوەی پەیوەندییە تایبەتیە کۆمەلآیەتیەکان.
٤- ڕێکخستنی نانیزامی بنەماو پێوەری پەیوەندیکردن و بارودۆخی تایبەتی هەیە، مەرج نیە سەرچاوەکەی ڕێکخستنی نیزامی بێت، ئەو ڕێکخستنە بایەخ بە واتە وات دەدات، سیستمی پەیوەندیکردنی کارای هەیە.
ڕەنگە ئەو دیاردانە لەئەنجامی جولەو شێوازو ئاماژە پێکردنە تایبەتیەکانی پەیوەندیکردن بن، کەهەموو تاکێك لەناو گروپەکان تێی دەگەن.

٥- مانەوەی ڕێکسختنی نانیزامی پێویستی بەپەیوەندییە جێگیرو بەردەوامەکان دەبێت لەنێوان ئەندامەکانی، بۆیە دەبینین بەرهەڵستی ڕێکخستنی نیزامی دەکات کاتێ ئەم ڕێکخستنە پەنا دەباتە بەر ڕوودانی گۆڕانکاری لەبوارێکی دیاریکراو کە ڕەنگە ببێتە هۆی هەڕەشە لەپەیوەندییە جێگیرەکان.

٦- ئامانجەکانی ڕێکخستنی نانیزامی ئامانجی هەر ئەندامێکە، لەکاتێکدا ئامانجەکانی ڕێکخستنی نیزامی مەرج نیە ئامانجی هەموو ئەندامێ بێ.

٧- ئینتمای تاك بۆ ڕێکخستنە نانیزامیەکان بەمەبەستی تێرکردنی پێویستیە مادی و مەعنەوییەکان یان کۆمەڵایەتیەکان دەبێت.

لەکاتێکدا ئامانجی تاك لەڕێکخستنی نیزامی لەچوار چێوەی ئەرکەکانیدا کۆ دەبێتەوە.

## سەرکردایەتی لەڕێکخستنی نانیزامی : (١١٦)

مەبەست لەم جۆرە سەرکردایەتیە گەیشتنی تاکە بۆ پێگەی سەرکردایەتی لەسەر خواستی تاکەکانی ناوگروپەکە یان ڕێکخستنە نانیزامیەکە، هەلبژاردنی ئەو تاکە بۆ پێگەی سەرکردایەتی بەهۆی کارتێکردنی ڕەفتارەوە دەبێ و بەشێوەیەکی کارا لەسەر چالاکیەکان گروپ و ڕەفتارە ئاراستە کراوەکەی بەرەو جێ بەجێکردنی ئامانج و ویستە تایبەتیەکان.

بۆیە سەرکردە لێرەدا پێگەیەکی فەرمی لەڕێکخستنی نیزامی ناگرێتەوە بەلام دەگاتە ئەو پێگە سەرکردایەتیە لەناو گروپە نانیزامیەکە بۆ هۆی تواناکانی و ئاکارە کەسایەتیە کاریگەرییەکانی لەوانی تر، بەم پێیە دەسەلاتی پشت دەبەستێت و بەردەوام دەبێت بەپێی خواست و ئارەزووی ئەندامانی گروپ.

بۆیە دەکرێت سەرکردەی نانیزامی پێناسە بکەین کە ئەو کەسەیە توانای کارتێکردنێکی قوڵی لەچالاکیەکانی ڕێکخستنی نانیزامی هەیە.

لـە تۆژینەوەیـەکی (وایـت) دەربـارەی سـەرکردەی ڕێکخـستنی نـانیزامی بـۆی دەرکەوت کەسەر کردەی نانیزامی خۆی لەئاست ڕێکخستنەکەی وادادەنێت کە :

١- بەرپرسی یەکەمی هەموو ئەندامانە.

٢- بەرپرسی یەکەمـە لـە هەوڵدان بـۆ جـێ بـەجێکردنی ئارەزووەکانیـان و دابەشکردنی کار لەنێوانیاندا.

٣- کار بۆ ئەوە دەکات کە گروپەکەی یەکەیـەکی یـەکگرتووبن، هـەوڵی جـێ بەجێکردنی ئامانجە هاوبەشەکانیان بدەن.

٤- خۆی بەوتەبێژی یەکەمی فـەرمی دادەنـێ لەسـەرگروپەکەی، نوێنـەریان دەبێت لە نواندنی بیرو ڕاکانیان لەبەردەم ئەوانی دی.

## جۆری دەست گەرییەکانی فشار : (١١٧)

١- دەستەگەری سیاسی :

دەستەییکن بەرژەوەندییان تەنها لەچوار چێوەی کـاری سیاسـیدایەو پێییـان دەگوترێت (لۆبی).

٢- دەستەگەری نیمچە سیاسی :

وەك سـەندیکای کرێکـارانی کۆمەڵـەی جوتیـاران ..هتـد، هەرچـەند چالاکیەکانی ئەم جۆرە ڕێکخراوانە سیاسی نیە، بەلام بـەبێ چالاکی سیاسی ناتوانن ئامانجەکانیان بێتەدی.

٣- دەستەگەرییە مرۆڤایەتیەکان:

وەك ڕێکخراوەکـانی منـدالان و فێرخوازەکـانی پەیوەنـدییان بـەکاری سیاسیەوە نیە.

٤- دەستەگەرییە خاوەن ئامانجەکان :

ئەم جۆری گروپە بەپێی ئامانجەکانیان گۆڕانیان بەسەردا دێت.

٥- دەستە گەرییەکانی بەرژەوەندی لایەنی دەرەکی .

## هەندێ رووی جیاوازی نێوان ئۆرگانە نیزامیەکان و گروپە نانیزامیەکان: (١١٨)

١- پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامان :

پەیوەندی لەنێوان ئەندامانی لەئۆرگانێکی سیستمی (نیزامی) بەزۆری سنورداروبڕیار دراو دەبێ، بەلأم پەیوەندیکردن لەنێوان ئەندامانی گروپە نانیزامیەکان خۆر رەس و دیاری نەکراو دەبێ.

٢- سەرکردایەتی :

سەرکردە لەئۆرگانە نیزامیەکان بەبڕیار یان هەلبژاردن دیاری دەکرێن، بەلأم سەرکردە لەگروپە نانیزامیەکان هەلقولأوی خودی گروپەکان .

٣- چاودێری لەسەر رەفتار:

لەئۆرگانە نیزامیەکان چاو دێری ئەندامان دەکرێ و رەفتاریان سنوردرا دەبێ بەهۆی لیپرسینەوە، بەلأم لەناو گروپە نانیزامیەکانی چاو دێری بەمەبەستێکی تایبەت دەبێ و بەرێگای خۆرسی و ناراستەوخۆ.

٤- پشت پێ بەستن :

ئەندامانی ئۆرگانە سیستمیە (نیزامیە)کان زیاتر پشت بەسەرکردەکانیان دەبەستن بەبەراورد کردن لەگەلّ ئەندامانی گروپە نانیزامیەکان.

# باسی هەشتەم

## کارلێکردن لەنێوان ئۆرگانەکان

لەو بابەتەگرینگانەی جێگای باس و لێکۆلینەوەن پەیوەندییەکانی نێوان ئۆرگانەکانە لەچوار چێوەی یەك حزبدا، ڕۆڵی ئەو پەیوەندییانە لەجێ بەجێکردنی ئامانجەکان چۆنە، هەروەها لە کار لەیککردنی نێوان ئۆرگانەکان بەگشتی.

پەیوەندیکردن بناغەی هەموو کار لەیککردنێکە لەڕووی ڕێکخراوەیی و سیاسیەوە، ئەگەر ئەندام و ئۆرگانەکان لەئاستی پەیوەندیکردنەکانیان لاوازبن ئەوا کار لەیەککردنەکانیان وەك پێویست نابێت، مەبەستیش لەپەیوەندیکردن هەموو ئەو شێوازانەیەکە بە هۆیانەوە ئەندام یان ئۆرگان کارتێکردنی دەبێت بەسەرلایەنەکەی تر، بۆیە حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکان بۆ بوون و تەواو کاری خۆیان جەخت لەسەر ئەو پەیوەندییانە دەکەن.

لەو پەیوەندیکردنانە ڕادەی وابەستەیی نێوان ئەنداامان و ئۆرگان بەدەردەکەوێت، ئاستی لەیەکچوون و نزیکبوونەوەی هەست و بیروباوەڕەکانیان و ڕادەی پابەندییان بە پێڕەوی حزبی و ڕێنماییەکان ئاشکرا دەکات، واتا ڕادەی کار لەیەککردنی ئاڵ و گۆڕی نێوان ئۆرگانە پەیوەندارەکان دەردەخات بەپێی زنجیرەی پەیکەری ڕێکخراوەیی حزب.

پەیوەندیکردن لەنێوان ئۆرگانەکان بنچینەی یەکەمی بوون و گەشەپێدانە، هەروەها پێوەرێکە بۆ سەرکەوتن و تێشکان.

دەکرێت گرینگی پەیوەندیکردنی ڕێکخراوەیی بەچەند خاڵێك كورت بكەینەوە : (١١٩)

١- پەیوەنــدیکردن بەیــەك لــەهۆکارە کاریگــەرەکان دادەنرێــت لەئاراســتە و بۆچوونەکانی ئەندام لەناوئۆرگانەکان.

٢- پەیوەنــدیکردن یارمــەتی گواســتنەوەی زانیاریــەکان دەدات لەســەر چــاوەی زانیارییــەوە بــۆ لایــەنێکی تــر بەمەبەســتی ســوود لێــوەرگرتن بەشــێوەیەکی لەبار .

٣- بــەهۆی پەیوەندیکردنــەوە بڕیــارە جــۆراو جۆرەکــان جــێ بــەجێ دەکــرێن دەربــارەی نەخەشــەو چــالاکیەکانی ئۆرگــان هــەروەها بڕیــاردان دەربــارەی کێشەو چارەسەریەکان.

٤- پەیوەندیکردن دەروازەی چالاکیەکانی کارگێرییە بۆ ڕێکخستنی هەوڵەکان.

کــار لــەیککردن گــرینگترین خەســلەتە کــە حــزب وریکخــراوە سیاســیەکان لــەجۆرەکانی تــری وەك ڕێکخــراوو کۆمــەڵی مرۆڤایــەتی لەیــەك جودادەکاتــەوە، لەبەر ئەوەی ئەندامانی ئۆرگانە حزبیەکان لەیەك ژینگەی ڕێکخراوەیی هــزری دەژین، چەندین بنەمای هزری و ڕێکخراوەیی ڕۆڵیان دیاری دەکات کە کاریگەری بەسەر رادەی ئەرك بەجێگەیاندنی دەبێت.

ئەگەر پێناسەیەکی کورت بـۆ کـار لەیـەککردن بدۆزینـەوە، دەکرێـت بـەم چـەند ڕستەیە باسی بکەین:

کــار لەیــەککردن بریتیــە لەهــەر ڕووداوێــك کــە بــەهۆی کــارتێکردنی یــەك لەلایەنــەکان ڕووبــدات و کــارتێکردنی هەســت پێکــراوی هــەبێت بەســەرکردارو دیاردەکان.

**کار لەیەککردن لەسێ ڕەگەزی گرێدراو بەیەکەوە پێکدێت کە بریتین لە** : (١٢٠)

١- کەسەکان وەك ئامرازێك بۆ کار لەیەککردن.

٢- کۆمەڵ وەك سیستمێك کە لەچەند کەسایەتیەکی کارا پێکهاتووە.

٣- کەلتور وەك سیستمێك لەبەهاوپێوەرو ئامانجەکان.

کار لەیەککردن لەناو ڕێکخراوو ئۆرگانی سیاسی یان هەر ڕێکخراوو دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی چەند فاکتەرێکی ناوخۆیی و دەرەکی هەیە، بەگشتی ئاماژە بۆ گرینگترینیان دەکەین :

١- گونجاندن و تەبایی نێوان ئەندامانی ناو ئۆرگان، نزیکبوونەوەیان لەبیروراو بەهاکان.

٢- تواناکان بۆ بەجێهێنانی پێداویستی و خواستی ئەندامان.

٣- بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئۆرگان.

٤- ئاستی هۆشیاری و رۆشنبیری ئەندامان.

٥- ئاستی لێهاتوویی سەرکردایەتی و شێوازی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان.

٦- هەل و مەرجی کۆمەڵگە لەڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە .

٧- رادەی لەباری و گونجانی سیستم و بنەما ڕێکخراوەییەکان لەگەڵ بارو دۆخی کۆمەڵگە .

٨- پیادەکردنی شێوازی دیموکراسیەتی ناو خۆو هەڵبژاردن لەئۆرگانەکان.

**تیۆرەکانی کار لەیەککردنی ئۆرگانەکان** : (١٢١)

لێرەدا چەند تیۆرو بۆچوون هەیە شێوازی کارتێکردن و کارلێکردنیان ڕوونکردۆتەوە :

١- تیۆری کاتل :

بەکورتکراوەیی ئەم تیۆرە بریتیە لە :

کەسایەتی ئۆرگان کاریگەر دەبێت بەکەسایەتی ئەندامانی، هەر دوولا ئاکارە ناوخۆییەکانی ئۆرگان پێکدێنن کەلەبەر ڕۆشنایی ڕۆڵ و پلەو پەیوەندی و پێگە گرینگەکان لەسەرکردایەتی و بەرەو خوار دیاری دەکەن.

٢- تیۆری زانایان (شیبولت وکلی) :

بریتیە لە :

**ئەندامان پارێزگاری لە پلەکانیان دەکەن لەناو ئۆرگانـدا ئەگەر ئـە نجامی کـار لەیەککردنیان دەسکەوت و سەرکەوتنیان بۆ بەدی بهێنێ.**

٣- تیۆری شوتز :

ئەندامان رەفتارەکانیان ئاراستەی ئەوانی تر دەکەن وەك بەدەنگ هاتنێك بۆ پێداویستەکانیان، هەروەها بەم پێیە ئەندامان روو لەکۆمەڵ دەکەن وەك دەربڕینێك لەسەر پێویستیان بۆ پەیوەندیکردن یان دەرخستنی خۆشەویستی یاخود سەرنج ڕاکێشانیان، هەروەها روو لەو لایەنە دەگەن بەمەبەستی دەست ڕۆییان بەسەرکەسانی تر، هەندێکی تر روو لەکۆمەڵ (ڕێکخرا) دەکەن لەبەر چەند هۆیەکی دەروونی.

بۆیە پەیوەندییەکانی نێوان لایەنەکان هاوتا بێت بەجۆرێك کەمانەوەو بەردەوام بوون دەستەبەر بکات یان یەکسان بێت و ببێتە هۆی لاوازی و دوواکەوتن.

٤- تیۆری هارولد لیافیت :

ناوبراو زانایەکی دەروونناسی کۆمەڵایەتیە، زنجیرە توێژینەوەیەکی ئەنجامدا لەگەڵ چەند تیمێك، چالاکیەکانی بەزۆری دەربارەی ڕێکخراوە بچووکەکان بووە.

٥- تیۆری بیلز :

ئەم زانایە نموونەیەکی خستەڕوو دەربارەی کار لەیەککردنی ئەندامان بەهۆی ئەو نموونەیە جیاکاری لەنێوان چوار توێژ ئەنجامدا، هەر توێژێك دژی ئەوی تر کاری کردوە لەئاکارو هەڵوێستەکانی، هەروەها کار لەیەککردنی دژەکان ئاشکرا دەکات لەچوار چێوەی یەك ڕێکخراودا، بەم کارەی ئاماژە بۆ گرینگی ئۆرگانە بچووکەکان دەکات لە بەدیهێنانی تێگەیشتن و کار لە یەککردن، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەو بوارەی کەچۆن خەسڵەتەکانی پێدەگات لەناو ڕێکخراوێکداو بەوکارە بەشداری لەبەردەوام بوونی دەکات و دەرفەت بۆ ئەندامانی دەرەخسێنێ کەئاکارەکانیان بەکار بهێنن.

## چەند نموونەیەك لەشێوازەکانی کارلێکردنی نێوان ئۆرگانەکان :

زۆربەی حزبە سیاسیەکان پێکهاتەی ڕێکخراوەییان لەچەند ئاستێك پێکدێت، ئەو حزبانەی زیاتر فراوانن و بنکەی جەماوەریان گەورەیە لەسێ ئاست پێك هاتوون.

ئاستی یەکەم، ئۆرگانەکانی سەرکردایەتی ناوەندو مەکتەبی سیاسی دەگرێتەخۆی، دەسەڵاتە گەورە گرینگەکان لەم ئاستەدایە، ملکەچی و جێ بەجێکردنی ئاستەکانی خوارووتر دەگرێتەوە، ئەو ئۆرگانانەی لەم ئاستەدا بۆ نموونە بەرپرسیارە لەجێ بەجێ کردنی بڕیارو پێش نیازەکانی کۆنگرەی گشتی، بڕیاری دەرکردنی ئۆرگانی ناوەندی، مافی سزادان و لەکارخستنی ئەندام و کادیران، سەرپەرشتی کردنی سەرجەم کاروباری مەکتەبی ناوەندییەکان لەڕووی سیاسی و ڕێکخراوەیی و هزری و جەماوەرییەوە، پەیوەندییە دەرکی و ناوخۆییەکان.

ئاستی ناوەند ئەو ئۆرگانانە دەگرێتەوە کە سەرکردایەتی هەرێمێك یان پارێزگایەك دەکەن و رابەرایەتی جەماوەری و رێکخراوەیی دەکەن لەناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو، ئەرك و دەسەلاتیان لەوە تێپەڕناکات، سەرەڕای گەیاندنی بڕیارو رێنماییەکانی ئۆرگانە سەرکردایەتیەکان بۆ خوارووتر لەگەڵ بەرزکردنەوەی پێش نیازو داواکاریەکان بۆ سەرووتر .

ئاستی سێیەم، ئۆرگان و بنەکە جەماوەریەکان دەگرێتەوە کە پەیوەندی راستەوخۆیان بەجەماوەرەوە هەیە، ئەرکی سەر شانیان گەیاندنی سیاسەتی حزبەکەیە بۆ جەماوەر.

پێڕەوی ناوخۆی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لەچەند برگەیەکدا ئەو بنەمایانەی دەس نیشانکردووە کە ئۆرگانەکان لەچوار چێوەیدا هەلس و کەوت دەکەن و شێوەی پەیوەندیکردنیانی دیاری کردووە.

## (بەندی ١١)

١- بڕیار دان و جێ بەجێکردنی فەرمانەکانی رێکخستن لەئۆرگانەکاندا بەزۆرینەی رەها دەبێت و زۆرینەش رێز لەکەمایەتی دەگرێت.

٢- ئۆرگان و دەزگاکان بەهەلبژاردنی ئازادو نهێنی پێك دێن.

٣- ئۆرگانەکانی سەروو لەکارو فەرمانەکانی رێکخستندا ئاگاداری ئۆرگانەکانی خواروو دەکەن، ئەوانیش پابەند دەبن.

٤- رادەربڕین، بۆ چوون، رەخنەو رەخنەلەخۆ گرتن ئەرك و مافی دیموکراسی ئەندامان.

پێڕەوی ناوخۆی پارتی سۆسیال دیموکراتی ئەلمانیا، شێوازی پەیوەندیکردنی نێوان ئۆرگانەکان بەچەند خاڵێك و لەچەند بەشێکدا روونکردۆتەوە.

## مادە /٢٣ : ٩

سەرۆکی ئەنجومەنی راوێژی حزب و سەرۆکی کۆمیسیۆنی کۆنترۆل لەکۆبوونەوەکانی سەرۆکایەتی وەك راوێژکار بەشداری دەکەن، ئەندامانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی راوێژ ئەندامی سەرۆکایەتی حزب نین.

## مادە/٢٤ : ١

سکرتێری گشتی حزب بەراوێژ لەگەڵ سەرۆکی حزب وسەرکردایەتی کاروبارە سیاسیەکانی حزب لەسەر بنچینەی بریارەکانی حزب و سەرۆکایەتی، حزب بەڕێوەدەبات سکرتێری گشتی سەرپەرشتی کاروبارەکانی حزب دەکات و ناوەندی حزب بەڕێوە دەبات و بەرپرسە لەئامادەکاری و جێبەجێ کردنی پێویستیەکانی پێشبرکێی هەلبژاردنی پەرلەمانی فیدرالی، سکرتێری گشتی بەراوێژکردن لەگەڵ سەرۆکایەتی حزب رابەری کاروبارەکانی حزب لەسەر ئاستی هەموو ئەڵمانیای فیدرالی دیاری دەکات.

## مادە/٢٤: ٣

سەرۆکایەتی حزب بەراوێژ لەگەڵ گەڕەکەکان، هاوسانی دارایی لەناوەوەی سەرتاپای حزب بەئەنجام دەگەیەنێت.

## مادە/٢٥: ٤

لەکۆنفرانسەکانی حزبدا لەگەڕەکەکان، لەسنوری هاوبەندی هەرێمی، هەردوو ساڵ جارێك نوێنەران بۆ کۆنگرەی حزب هەلدەبژێردرێن، سەرۆکی حزب رێسای رێکخستن و دابەشبوونی نوێنەران بەسەر یەکە یەکەی گەرەکەکان و هاوبەندییە هەرێمیەکان و ڕێوشوێنەکان دیاریدەکان.

## مادە/٢٦ : ١

سەرۆکی حزب هەموو کاتێك دەتوانێت کۆنترۆڵی ئۆرگانەکانی حزب و گروپەکانی کارو کاروبارەکانیان بکات داوای والاکردنەوەو ژمێریاری بکات، مافی هەیە لەهەموو کۆبوونەوەکانی ناو حزبدا بەشداری بکات و ئامۆژگاری پێشکەش بکات.

٣- سالانە لەدرەنگترین کاتدا لەدوای تێپەڕنی سێ مانگی یەکەمی سالی نوێ، سەرۆکایەتی گەرەکەکان راپۆرتی سالانە دەنێرن بۆ سەرۆکایەتی حزب، لەبارەی کاروبارەکانیان، باری سیاسی و ئابووری – داهات و خەرجیان، هەروەها چۆنیەتی بەکار هێنانی ئەو کەرەسەو مادانەی لەسەرۆکایەتی حزبەوە بۆیان نێردراوە.

٤- سەرۆکایەتی حزب ڕێنمایی وردتر دەردەکات کەپەیوەستن بەهەڵس و کەوتی نوێنەران و ئەندامان بەرامبەر ئەو ئەرك و وەزیفانەی پێیان دەسپێردرێ.

٥- گەڕەکەکان دەتوانن هەموومافە دیاری کراوەکان، بۆ هەریەك لەگۆشەو کایەکانی ڕێکخستنەکانیان بچەسپێن.

## مادە/٣٠ : ١

ئەنجومەنی راوێژ لەلایەن سەرۆکایەتی ئەنجومەن بانگ دەکرێت بۆ کربوونەوەی راوێژکاری، سەرۆکایەتی ئەنجومەن کات و بەرنامەی کۆبوونەوەکان لەنامەی بانگهێشتن دیاری دەکات، بەشێوەیەکی ڕێسایی ئەنجومەنی راوێژ هەرسێ مانگ جارێك کۆدەبێتەوە.

٢- سەرۆکایەتی حزب بەسەرۆکایەتی ئەنجومەنی راوێژ رادەگەیەنێت، کە چ پرس و خالێك بەپێی بەشی ٢ و بەشی ٦ی مادەی ٢٩ پێرەوی ڕێکخستن و بەشی ٤ مادەی ١ پێرەوی دارایی، بخرێتە کۆبوونەوەی راوێژکاری، هەروەها کام خواست

کەبەپێی بەشی ٢ و ٤ ی مادەی ٢٩ پێڕەوی ڕێکخستن لەکۆنگرەی حزبەوە نێردراوە بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژ، پێویستە ڕاوێژی لەسەر بکرێت.

## مادەی/١٣٤ : ١

کۆمسیونەکانی بڕیار لەلایەن بنگەرەکە و گەرەك و سەرۆکایەتی حزب پێکدەهێنرێت ئەگەر پێویست بێت دەتوانرێت کۆمەڵێك کۆمیسیۆن پێکبهێنرێت، کەلە لایەن ڕاسپێرەر بەلای کەمەوە تاکۆتایی ئەرکەکانیان ماوەی کارکردنیان بۆ دیاری دەکرێت.

## مادە/ ٣٥ : ٤

هەموو ئۆرگانێکی حزب دەتوانێت داخوازی جێ بەجێکردنی و گرتنەبەری ڕێوشوێنە پێرەویەکان بکات، دژی ئەندامێك بەڕێگای کۆمیسیۆنی بڕیاری ئەو بنگەڕەکەی کە ئەندامەکەی تێدایە، بیخاتە بەردەم سەرۆکایەتی حزب.

### بۆ تێگەیشتن لەرادەی کارلەیەککردنی ئۆرگانەکان وەڵامێك بۆ ئەم بۆچوونانەی خوارەوە دیاری بکە :

١- ئایا سەرکردایەتی ئۆرگان (بەرپرس یەکەم) لەئاست ئاراستەکردن و رابەرایەتی ئۆرگانەکەیە؟

٢- ئەو سەرکرادایە تیە بە شێوازی پیادەکردنی دیموکراسیەت و سەرکردایەتی بەکۆمەڵ کار دەکات؟

٣- ئایا سەرکردایەتی گەورەترین تواناکانی کارتێکردنی بەکار دەهێنێ؟

٤- تاچەند سەرکردایەتی بایەخ بەکێشەو کەم وکورتیەکانی ناو ئۆرگان دەدات؟

٥- ئایا سەر کردایەتی هەلی لەبار بەکار دەهێنێت بۆ دەست خستنە ناو کێشەکان؟

٦- ئایا سەرکردایەتی هەل و مەرجی لەبار دەخولقێنێت بۆ سەرکەوتنی کۆ بوونەوەکان؟

٧- لەهۆیەکانی سەرنەکەوتنی ئۆرگان دیاری نەکردنی ئەرك و مافەکانی ئەندامە؟

٨- پەیکەری ڕێکخستن چەندی لەباری ئالۆزبوون و زۆربوونی لق و بەش بێت، ئەوا دەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی .

٩- ئایا سەقامگیری بارو دۆخی ناو ئۆرگان و بەسیستم بوونی کاروچالاکیەکانی لەهۆیەکانی سەرکەوتنیەتی.

١٠- شێوازی هەلسوراندنی کاروبارەکانی ناوەندێتی بێت یان ناوەندێتی؟

١١- ئەگەر کۆبوونەوەکان لەکاتی خۆیدا گری بدری، تاچەند ئامانجەکانی ئۆرگان جێ بەجێ دەکات.

١٢- تاچەند شەفافیەت وشێوازی رەخنەو رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن پێرەو دەکرێت لەماوەی بەرێوەبردنی کاروبارەکان؟

١٣- بۆ دیاری کردنی بەرپرسی پلەو پایەکان ئایا شێوازی هەلبژاردن یان دانان پیادە دەکرێت؟

١٤- زانیاری و راپۆرتەکان بەچ شێوازێك دەگات، چەند ناوەند دەبرێت، کاتی بەسەرچووە یان زۆرە، کار بەناوەرۆکەکانی دەکرێت یاخود پشت گوێ دەخرێت؟

١٥- شێوازەکانی هۆشیارکردنەوەو هۆیەکانی رۆشنبیرکردنی ئەندام و کادیرانی ناو ڕێکخستن تاچەند کاری پێ دەکرێت، تاچەند کاریگەری هەیە بەسەر چالاکیەکان؟

١٦- ئۆرگان بەرنامەی کاری بە قۆناغی هەیە؟

١٧- ئایا کادیرا زیاتر لەئەرکێکی پێ سپێراوە؟

## سەرچاوەو پەراوێزەکان


١. گۆڤاری (الهدف – ٢٠٠٠) ساڵی دووەم – ژمارە ٧٥ ، ١٩٧٥ ، چاپی عەرەبی/القاهرە.
٢. حزبی سیاسی لەکۆمەڵگەی سەردەم – عوسمان علی ویسی – چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٩، لاپەڕە ٥٣.
٣. نظام الحزب الواحد وأثره على الحقوق السياسية للمواطن – مولود مراد محي الدين – ط١ – ٢٠٠٧، ص٢٧.
٤. ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان – مسعود عبدالخالق – ٢٠٠٨/لاپەڕە/٣٥.
٥. موسوعة علم الاجتماع – احسان محمد الحسن – ط١٩٩٩/١ ، ص ٢٥٩.
٦. النظم السياسية- محمد كاظم المشهداني – جامعة الموصل /١٩٩٠ ص ٢١٩.
٧. نظام الحزب الواحد – سەرچاوەی پێشوو – لاپەرە ٣٢.
٨. الشيوعية العلمية – معجم – دار التقدم – موسوکۆ/١٩٨٥ ص٤.
٩. سیستمی حزبی لەئەمریکا – ڤیان مجید – چاپی یەکەم – ٢٠٠٨ – لاپەرە ٤٤-٤٦.
١٠. نظام الحزب الواحد ....سەرچاوەی پێشو – لاپەرە ٣٣- ٣٥.
١١. التعددية الحزبية في الفكر الاسلامي الحديث – دیندار شفیق الدوسکی – چاپی (١) ساڵی ٢٠٠٩، لاپەرە/٢٦.
١٢. الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكوردية في نصف قرن (١٩٠٨ – ١٩٥٨) ، چاپی ٢ ساڵی ٢٠٠٧ – عبدالستار شریف – لاپەرە ٣٧.
١٣. حزبە سیاسیەکان لەکۆمەڵگای سەردەم – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە/٥٤.
١٤. سەر هەڵدان و بەردەوامی حزبە سیاسیەکان لەرۆژ ئاوادا – حوجەتوللا ئەیوبی – وەرگێڕانی ئازادوەلەدبەگی چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ – لاپەڕە ٧٧ – ٧٨.
١٥. موسوعة علم الواحد – سەرچاوەی پێشو – لاپەرە/٦١٨.
١٦. نظام الحزب الواحد – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ١١
١٧. التعددية الحزبية - سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ١١-١٢.
١٨. الشيوعية العلمية – معجم – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ٢٠٣.
١٩. الاحزاب السياسية في العالم المعاصر – نبيلة عبدالحليم كامل – ١٩٨٦ – بیروت/لاپەڕە/٨٢.
٢٠. فەرهەنگی رامیاری نیگار – ئازادوەلەدبەگی چاپی یەکەم ٢٠٠٥ لاپەرە/٨٧.
٢١. التعددية الحزبية – سەرچاوەی پێشو. لاپەڕە/٣٩.
٢٢. علم الاجتماع السياسي – فيليب برو – ترجمه محمد عوب – چاپی یەکەم ساڵی ١٩٩٨ لاپەڕە ٣٧١.

٢٣. دامەزراوە سیاسیەکان و یاسای دەستوری و سیستمە سیاسیە گەورەکان – موریس دفر یجیە – وەرگێران – جورج سعد. چاپی یەکەم سالی ١٩٩٢، لاپەرە ٧٠-٧١.
٢٤. کۆنگرە – پاشکۆی کوردستانی نوێ – ژمارە (٣٥) لەرۆژی ٢٦/١٠/٢٠٠٩، بابەتی نووسەر ئەرسەلان مەلاحسن.
٢٥. کۆمەڵناسی سیاسی – احمد نقیب زادە – وەرگێر مسعود رەواندوستی – چاپی یەکەم سالی ٢٠٠٧ لاپەرە/٢٤٠.
٢٦. العددية الحزبية – سەرچاوەی پێشو – لاپەرە ٣٢.
٢٧. موسوعە علم الاجتماع – سەرچاوەی پێشو – لاپەرە ٦١٧.
٢٨. المعجم النقدی لعلم الاجتماع (ر. بودون) و (ف. بوریکو)، وەرگێران – سلیم حداد چاپی ٢ سالی ٢٠٠٧ لاپەرە/٢٢-٢٤.
٢٩. حزبی سیاسی لەکۆمەڵگەی سەردەم – سەرچاوەی پێشو – لاپەرە ٣٦.
٣٠. الاحزاب السياسية في العالم المعاصر – سەرچاوەی پێشو – لاپەرە ٨٢.
٣١. مسألة الشخصية في كوردستان، خصائص المناچل اليوری – پ.ك.ك. ١٩٨٦ لاپەرە
٣٢. لينين وقضايا النضال التحرري – ئاژانسی (نوفوستی – ١٩٧٠ لاپەرە/٣٤.
٣٣. التنظيم والجماعات - د. حسان الجيلانی – چاپی یەکەم سالی ٢٠٠٨ لاپەرە/١٥.
٣٤. هەمان سەرچاوە لاپەرە/١٦
٣٥. هەمان سەرچاوە لاپەرە/١٨
٣٦. مفاهيم في الفلسفة و الاجتماع، احمد خورشيد، چاپی یەکەم ١٩٩٠ بغداد لاپەرە ٢٤٠.
٣٧. موسوعة علم الاجتماع – سەرچاوەی پێشوو – لاپەرە ٦٤٠.
٣٨. التنظيم والجماعات – سەرچاوەی پێشو – لاپەرە ٢٠-٢٣.
٣٩. نظرية المنظمة (المنظمة ونظرية التنظيم) – عمر و صفی ، قيس المومنی – چاپی چوارەم سالی ٢٠٠٩ لاپەرە ٢٠٦.
٤٠. نظرية المنظمة (المنظمة ونظرية التنظيم) – هەمان سەرچاوە – لاپەرە ٢٢٣.
٤١. نظرية المنظمة (المنظمة ونظرية التنظيم)- هەمان سەرچاوە – لاپەرە ٢٢٦.
٤٢. هەمان سەرچاوە – لاپەرە ٢٣٠.
٤٣. هەمان سەرچاوە – لاپەرە٢٣٤.
٤٤. هەمان سەرچاوە – لاپەرە ٢٤٧.
٤٥. هەمان سەرچاوە – لاپەرە٢٥٠.
٤٦. الهياكل والاساليب – نائل عبدالحافظ – ٢٠٠٩ – عمان – لاپەرە ٣٧.

٤٧. المفكر التنظيمي – عامر الكبيسي – چاپی یەکەم ٢٠٠٤ – سوریا – لاپەڕە ١١٥.

٤٨. نظرية المنظمة – سەرچاوەی پێشوو – لاپەڕە ٢٧٠.

٤٩. نظرية المنظمة – سەرچاوەی پێشوو – لاپەڕە ٢٧١.

٥٠. الفكر التنظيمي – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ١١٤.

٥١. گۆڤاری بڕیار – ژمارە/١٢ ئایاری ساڵی ٢٠٠٩ – بابەتی نووسەر/هاژە شوانی.

٥٢. الموسوعة السياسية – عبدالوهاب الكيالي، كامل زهير – چاپی یەکەم ١٩٧٤ – لاپەڕە ١٦٥-١٦٦.

٥٣. الفكر التنظيمي – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە- ١٣٧.

٥٤. التصميم النظيمي – عامر الكبيسى – چاپی ٢٠٠٦ – سوریا – لاپەڕە ٣٢.

٥٥. نظرية المنظمة – سەرچاوەی پێشوو – لاپەڕە ٦٦

٥٦. نظرية المنظمة – سەرچاوەی پێشوو – لاپەڕە ١٤.

٥٧. الفكر التنظيمي – سەرچاوەی پێشوو – لاپەڕە ٤٦.

٥٨. السلوك التنظيمي – عامر الكبيسى – چاپی یەکەم ٢٠٠٥ – سوریا – لاپەڕە ٣١.

٥٩. فەرهەنگی سیاسی – سەبا – عبدالقادر صالح – چاپی دووەم ٢٠٠٧ لاپەڕە /١٤٤ .

٦٠. المعجم الحديث للتحليل السياسي – وەرگێران- سمير عبدالرحيم – چاپی یەکەم ١٩٩٩ لاپەڕە ٢٩٢

٦١. الاحزاب السياسية والتحول الديمقوراطي – بلقيس احمد منصور – چاپی یەکەم ٢٠٠٤ لاپەڕە ٢٠.

٦٢. سەرهەڵدان و بەردەوامی حزبە سیاسیەکان لە ڕۆژئاوادا – نووسینی حوجه الله ئەیوبی وەرگێڕان ئازاد وەلدبەگی چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ لاپەڕە ١٠٣.

٦٣. الهياكل والاساليب في تطوير المنظمات – نائل عبدالحافظ – ٢٠٠٩ عمان.

٦٤. پارتی سوسیال دیموکراتی ئەڵمانیا – پەیڕەوی ناوخۆ – وەرگێر عبدالمؤمن دەشتی – چاپی یەکەم ٢٠٠٨.

٦٥. الحركات الاسلامية و الديمقراطية (في الفكر و الممارسة) – مركز دراسات الوحدة العربية سلسلة ١٤ چاپی دووەم ساڵی ٢٠٠١ بیروت – لاپەڕە ٢٧٩.

٦٦. التصميم التنظيمي عامر الكبيسى – چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٦ لاپەڕە ٨٧.

٦٧. بەرنامەو پێرەوی ناوخۆ، پارتی دیموکراتی کوردستان – سەلمێنراوی کۆنگرەی (١٢) ساڵی ١٩٩٩.

٦٨. پرۆگرام و پێرەوی ناوخۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان – پەسند کراوی دووەمین کۆنگرە ٢٠٠١.

٦٩. الحزب الشيوعي العراقي – وثائق المؤتمر الوطني الخامس – تشرين اول ١٩٩٣.

٧٠. پارتی سوسیال دیموکراتی سوید- دەزگای هەڵبژاردنی (ی.ن.ك) ٢٠٠٨ سلیمانی لاپەڕە ٣٠-٣٥.

٧١. ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ – ژمارە (٤٥٠٥) لە ٢٠٠٨/٢/٢٥ کاوسێن بابەکر .

٧٢. سیستمی حزبی لەئەمەریکا – سەرچاوەی پیشو – لاپەڕە ١١٥-١١٨.

٧٣. الحركات الاسلامية والديمقراطية – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ٢٨٨.

٧٤. علم الاجتماع السياسي - سەرچاوەی پێشو - لاپەڕە ٤٠١ – ٤٠٣.

٧٥. سەرهەڵدان و بەردەوام بوونی حزبە سیاسیەکان لەرۆژئاوادا – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ١٢٨.

٧٦. سەرهەڵدان و بەردەوام بوونی حزبە سیاسیەکان لەرۆژئاوادا – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ١٣٩.

٧٧. موسوعة علم الاجتماع – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ٤٧.

٧٨. گۆڤاری مەدەنیەت – ژمارە ١٦ – شوباتی ٢٠٠٤ نووسەر – نەوزاد جمال .

٧٩. قضايا التوير والنهضة في الفكر العربي المعاصر – مركز دراسات الوحدة العربية، سلسلة ١٨ لاپەڕە ١٢٣.

٨٠. گۆڤاری ئەلتەرناتیف – ژمارە ٢ ساڵی ١٩٩٩ سلێمانی – بابەتی فؤاد قەرەداغی.

٨١. وحدة النشاط الايديولوجي والسياسي والتنظيمي للحزب الشيوعي – حميد بەخش – ١٩٨٤.

٨٢. گۆڤاری – سەنتەری برایەتی – ١٤ کانوونی یەکەم ١٩٩٩ هەولێر – نووسەر – محمد توحيد فام.

٨٣. الفكر القومي وقضاثا التجدد الحضاري – بكري خليل – چاپی یەکەم ٢٠٠٤ لاپەڕە ٢٠٧.

٨٤. گۆڤاری مەدەنیەت ژمارە ١٦ – سەرچاوەی پێشو .

٨٥. وحدة النشاط الايديولوجي والسياسي والتنظيمي – سەرچاوەی پێشو.

٨٦. بنەماکانی زانستی سیاسیەت – حسین بەشیریە – وەرگێر – ابوبکر کاروانی – چاپی دووەم ساڵی٢٠٠٩ لاپەڕە٨٠.

٨٧. نظرية المنظمة – مداخل وعمليات – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ٣٥٠.

٨٨. تیۆرەکانی سیستمە سیاسیەکان – کمال المنوفي – وەرگێر ئاوات احمد چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ لاپەڕە ١٥١.

٨٩. تیۆرەکانی سیستمە سیاسیەکان – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ٨٧.

٩٠. السلوك التنظيمي – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ( ١٤٨ ) .

٩١. الاحزاب السياسية و التحول الديمقراطي – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ٢٨٣.

٩٢. السلوك التنظيمي – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ١٣٦.

٩٣. بەڵگەنامەکانی کۆنگرە نیشتمانی پێنجەم – حزبی کومونیستی عێراقی – تشرینی یەکەم ١٩٩٣ – لاپەڕە ١١٦.

٩٤. پێڕەوی ناوخۆی پارتی سوسیال دیموکراتی ئەڵمانیا – پەسند کراوی ٢٠٠٥/١١/١٦. وەرگێڕانی – عبدالمؤمن دەشتی.

٩٥. موسوعة علم الاجتماع – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ٣٥٩.

٩٦. نظرية المنظمة – سەرچاوەی پێشو – لاپەڕە ٣٧٢.

٩٧. السلوك التنظيمي – احمدماهر – چاپى يەكەم الاسكندريه – لاپەڕە ٢٦٢.

٩٨. الاحزاب السياسية والتحول الديمقراطي – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ٢٨١.

٩٩. الشوعيه العلميه – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە/٢٨٤

١٠٠. نظرية المنظمة – مداخل وعمليات – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ٣٨٥.

١٠١. گۆڤارى نوێ بوون – مەڵبەندى ڕێكخستنى سليمانى – ى. ن. ك – ژمارە /٥ – ٢٠٠٨، ڕێبوار كريم.

١٠٢. التفاوض الاستراتيجية والاساليب – ناجي معلا – چاپى دووەم ساڵى ٢٠٠٠ – لاپەڕە ٨٠.

١٠٣. التحليل الاجتماعي ظاهرة الانقسام السياسي في الوطن العربي – عزالدين دياب – ١٩٩٣ پەلارە ٤١٧ – ٤١٨.

١٠٤. حزبه سياسيەكان لەميسر – وەگێرانى (ئەزى گۆران احمد قادر سعيد) چاپى يەكەم ٢٠٠٣ سليمانى لاپەرە ١٣٧.

١٠٥. ململانێ لەگەڵ ژياندا (ياداشت) – عبدالستار طاهر شريف ١٩٣٥ – ١٩٧١ – چاپى يەكەم ٢٠٠٥ كركوك – لاپەڕە ١٠٢.

١٠٦. دانوستانەكانى بزووتنەوەى ڕزگاريخوازى نەتەوەيى كورد و حكومەتەكانى عێراق – واحد عمر محى الدين چاپى يەكەم ساڵى ٢٠٠٦ لاپەڕە ٢١٤ – ١٣٤.

١٠٧. بەڵگەنامە – باڵى مەكتەبى سياسى و باڵى بارزانى – بەرگى – شازين هێرش – نزار محمد چاپى يەكەم ساڵى ٢٠٠٣ – لاپەڕە ١٩٨.

١٠٨. تيۆرەكانى سيستمە سياسيەكان – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ١٠٣.

١٠٩. ٦٧٧ مصطلح اداري – محمد فتحي – القاهره ٢٠٠٣ لاپەڕە ٢٠٩.

١١٠. نظرية المنظمة – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە٢٢.

١١١. تيۆرەكانى سيستمە سياسيەكان – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ٢٧ - ٢٨

١١٢. نظرية المنظمة – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ٢٧٣.

١١٣. نظرية المنظمة – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ٢٧٩.

١١٤. حزبى سياسى لە كۆمەڵگاى سەردەم – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ١١٠.

١١٥. السلوك التنظيمي – عامر الكبيسى – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ٧٨.

١١٦. نظرية المنظمة – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ٣٢٣.

١١٧. موسوعة علم الاجتماع – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ١٨١.

١١٨. السلوك التنظيمي – سەرچاوەى پێشو – لاپەڕە ٩٢ – ٩٤.